# ژیان و شیعری کاکەی فەلاح

دکتۆر عیزەدین مستەفا رسوول



لــە مێــژووی گــەلی عێراقــدا, ڕاپــەڕینی کــانوونی دووەمــی1948, ڕووداوێکــی گــەورە و درەوشــەدارو قــووڵ و شــوێن دیــارە. دروشمــی برایــی و پێکــەوە خــەباتی کــورد و عەرەب, لە نوسینی ڕۆژنامەیەکی نهێنی و بانگەوازی چەند پارتێکی نهێنییەوە بو بە تەوژمی جەماوەر و دەنگی گەل و بەخوێنی تێکەڵی برایان شەقامەکانی بەغدای سوور کرد.

هاواری بەغدا دەگەیشتە نەجەف و سلێمانی و لەوێوە دەنگی ئەدایەوە(1).

تــەرمی شــەهیدانیش هــەر لــەوێوە بــەرەو مەڵبەنــد دەنێررایــەوە. لــە هــەموو لاشــەوە دەستەدەســتەی خــەڵک دەچــوونەوە بەغــداو چــەپکە گوڵیــان دەبردەســەر گــۆڕی شەهیدان(2).

ئەنالیزی(3) گەورەیی و قووڵیی ئەو ڕووداوە, لە ڕووی مێژووییەوە هەر 10-15 ڕۆژی ڕاپەڕینەکە خۆی ناگرێتەوە.

ئـەو ڕاپەڕینــە لووتکــەی گردبوونــەوەی گــەردە گــەردەی ڕووداوو ئاڵۆزی و تەوژمی دیموکراتیی پاش جەنگی دووەمی جیهانــە, وەك چۆن, ســەرتاپای جیهانی گرتــەوە, لــە وولاتــی ئێمەشدا دیاریی داو ئەو ڕاپەڕینە وێنەی دەرپەڕینی بوو.

ئەگــەر ڕووداوە مێژوویی‌یەکــە ئــەو مەســاحە بەرینــە بگرێتەوە, دەبێ ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاپەڕینەش لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەر لەو مەساحەیەدا ببینین.

هــەر لەبــەر ئەوەیــە, هەنــدێك شاعیر کــە بــە ڕاســتی بــە شاعیری ڕاپەڕینی کانون دەناسرێن(4), زادەی ڕۆژانی پێش هەڵچوون و دەرپــەڕینن, یاهــەر لــەو ڕۆژانــەدا دەنگیــان بڵنــد بــۆوە, یــا بڵێێن لــە ســاڵی ئاواڵــە بــوونی دیمــوکراتیی پــاش ڕاپەڕینەکەدا ناسران(5).

کاکەی فەلاح یەکێکە لەو شاعیرانە.

ســاڵی1946, ئــەوو چــەند قوتابییــەکی تــری خــەڵکی دەرەوەی شــار, لەگــەڵ دامەزرانــدنی یەکــەم بەشــی نــاوخۆی قوتابخانەی ناوەندیی سلیمانیدا, هاتن بۆ خوێندن(6).

بەشــە ناوخۆیی‌یەکــەی ئــەوان شــوێن کۆبوونەوەیــەکی تــازەبوو, لەبــەر ئــەوە کــەوتبووە بەرچــاوی پارتی‌یــە سیاسی‌یەکان و یەکسەر دەستی چالاکیی بۆ درێژ کرا.(7)

وەك لــە بیرم بێت کاکەی فــەلاح پــێش هــەموو هاوەڵــەکانی ڕووی کردە چالاکیی شۆڕشگێری.

دەبــێ هــەر هەســتێکی بزوێنــی خــۆی, لــەپاڵ بــیری شۆڕشگێریدا بەرەو شیعری بردبێت, یا دامەزراندنی بەتینی بزووتنــەوەی شۆڕشگێریی ئەوسا لەســەر بناغــەی یــەکێتیی تیۆری و پراکتیك.

کە خوێندنــەوەی بــەردەوام دەســەپێنێ,(8), یــا ڕابــەریی ئــەدەب دۆســت و نووســەرێکی وەك ئەحمــەد غــەفوورو کۆبوونــەوە و دیــاربوونی گــەلێك شــاعیری وەك هــەردی و مــەدهۆش و بــەختیار زێــوەر و (ع.ح.ب) لــە ڕیــزی بزووتنەوەکەدا ئەو دەروونە مەنگەی شاعیری جووڵاندبێت.

ڕەنگە شاعیر خۆشی بە ووردی یەك ڕەگەزی پێ دەست نیشان نەکرێت و هەموویان تێکەڵ بکات. هەرچۆنێك بێت کاکەی فەلاح پێش ڕاپەڕینی کانوون دەستی دایە شیعر نووسین.

لــە ڕۆژانــی ڕاپەڕینەکــەدا کامــەران و دیــلان بــە خــەتیب ناســران(9). بــەڵام کاکــەی فــەلاح شــیعری دەخوێنــدەوە, شیعرەکانی ئەوسای چاوگی هەڵچوون و خۆپیشاندان بوون. دەنگــی لــەپێش بەنگینــەو (10) محەمــەدی مەلاحســینی حــافزدا(11) و لەگــەڵ ئەوانــدا, شــەقامەکانی سلێمانیی پردەکرد. ئەگەر لە بیرم بێت یەکەمجار لەماتەمی چلەی شــەهیدانی کانووندا لــە کۆبوونــەوەی حەوشــەی مزگــەوتی گــەورەی سلێمانیدا, بەرنامە پێشکەش کەر کاك ڕەشید خــەفاف بــە نــاوی کاکــەی فەلاحــەوە پێشکەشــی کــردو خەڵکەکەش ئەو ناوەیان خستە جێی ناوەکەی خۆی(12).

هەر لە ڕۆژانی پاش ڕاپەڕینەکەدا بوو, لە کۆبوونەوەیەکی بەردەمی سەیواندا هۆنراوەیەکی درێژی خوێندەوە. ئێستاش گوێم بەم دێڕە دەزرنگێتەوە کە جەماوەرەکە لەبەر ناوەڕۆکە گرنگەکەی چەند جار داوای دووبارە کردنەوەی کرد.

جەبهەیێکی نیشتمانی ڕێك بخەن توندو بەتین
وەك وولاتی هیندوسان و میللەتی یۆنان و چین(13)

هــەر پــاش ئــەوەش بــوو, لەســەر شــانی خۆپێشــاندەران هاواری دەکرد:

**من نەسووتێم, تۆ نەسووتێی کێیە ڕێ ڕۆشن ئەکا**
**کێیە چاری دەست درێژی و کردەوەی دوژمن ئەکا**
**ئەو کەسەی ڕۆڵەی سزایەو قاڵی بۆتەی مەینەتە**
**(14).............................................**

رابەریی چینی کرێکار لەو ڕاپەڕینەدا لە شیعری کوردیی ئەو سەردەمەدا ئاشکرا دیارە(15). کاکەی فەللاحیش هەر لەو سەردەمەدا ڕوو دەکاتە چینی کرێکار و دەڵێ:

**لە پێشا پێشکەش ئەو چینەی کە مەسئوولی گەلی ناوە(16)**
**بەپێی پێویستی بۆ پارێزگەری و پێشەنگی خولقاوە**

دەبێ کاکەی فەللاح خۆی لایەنی خۆیی و گشتی ئەم یادگارانە تۆمار بکات(17)، یا کەسێکی نزیکتر بە ووردی تۆماری بکات و هەندێک لاپەڕەی ڕەنگینی مێژووی گەل و مێژووی ئەدەبیاتمانی پێ بنەخشێنێ و لە شوێنی خۆیدا بلاوی بکاتەوە.

ئەوەی پێوەندیی بەم باسەوە هەیە و دەتوانرێ تۆمار بکرێ ئەوەیە کە پاش نوشوستیی ڕاپەڕینەکە کاکەی فەللاحیش لەگەڵ سەدان، یاهەزاران کەسدا چەند ساڵێک چووە بەندیخانەوە.

یانەی تایبەتی و یەکێتیی نووسەران نەبوو، زۆرجار دوکانێک دەبووە یانەی کۆمەڵە کەسێک، هەر دوکانە کەسی خۆی و بابەتی خۆی هەبوو، جۆرە پێوەندی و یەکێتییەک ئەندامانی یانەی بە خاوەن دوکانەوە دەبەست. ڕەنگە لەخۆیەوە نەبێ کە زۆرتری خاوەنانی ئەو دوکانانە بەرگدروو بوون.

باسی یانەی تر ناکەم، بەڵام یانەکەی ئێمە بناغەیەکی پتەوی هەبوو، پێش هەموو بیری شۆڕشگێری و بەشداری خەبات و ئەدەب دۆستی لەگەڵ ئەویانەیەی کۆ دەکردینەوە.

شێخ کەریمی بەرگدروو(بەرزنجەیی)(18) و تۆفیق محەمەد(19) تازە دوکانیان کردبوو بە یەک، ئێمەش هەر یەکە لەلای کۆنە دوکانی یەکێکیانەوە ڕوومان کردە ئەو یانە تازەیە.

تەمەن جیابوو، وەک تەمەنی کەسانی سەر بە هەموو یانەکان، پلەش هەر جیابوو. هەردیی شاعیر لە تەمەندا گەورەترو لە پلەدا بەرزتر بوو، کۆڵەکەی یانەکەمان بوو.

کاکەی فەللاح تازە لە جارێکی تری، ماوە درێژی بەندیخانەوە هاتبۆوە، دۆست و ناسیاوو هاوڕێی هەموومان بوو، بەڵام تیشکی هەردی ڕوەو ئەم یانەیەی هێنابوو، هەر چەندە لەگەڵ شێخ کەریمی کۆچ کردوو و کاک تۆفیقیشدا دوست بو.

دڵزارم لە بەندیخانەی کوت بە جێهێشت. هەر ئەمە سەرناوی یاداشت گێڕانەوەی ساڵانی بەندیخانەی ئەوو دانیشتنی چەند ڕۆژی ئێمە بو.

شیعری کۆن و نوێ ئەخوێندرایەوە، دیوانی شاعیران هەڵئەدرایەوە. لە دەنگی شاعیرێکی پیری وەک عارف عورفی قاپ ڕەشەوە(20) تا دوا پارچەی شاعیرانی تر. هەڵچون و نیشتنەوە بەرامبەر بە هەشت و یادگاری گۆران و شیعری دڵداری. هەندێ پارچە شیعرم نووسیبو، وا بزانم دوو چیرۆکیش بە عەرەبی، تێکڕا لای هەردی پەسند بوون، بەڵام خۆم شیعرەکانم لاکز بوون، کاکەی فەللاح هاتەوە، زۆری حەز دەکرد بەرهەمی من ببینێ، وابزانم هەر بۆ قەوارە گەورەکردن بو، چەند پارچە شیعرێکی ترم دروست کرد.

تێبینیی زۆر هێژاو ڕێ نیشاندەری دامێ، ئەو نەیوتبوو، بەڵام من شیعرەکانم دڕی.

بریار وابوو لەسەر خوانی چیرۆکەکان یەک بگرینەوە(21)، چۆوە بۆ چوارتا، لە ڕێگە پارچە شیعرێکی دڵداریی هەردیی بەدەستنووسی لە گیرفاندا گیرا. تووشی چەرمە سەری بو(22)، هەر ئەوەش سەرەتای خۆشاردنەوەی تازەی بوو(23).

پاش خۆشاردنەوەی بە چەند ساڵ، جارێک لەگەڵ بەڵگە نامەیەکی بەرزی ژیانمدا کە لە ڕۆژی1955/12/25دا نوسرابوو، دوکتۆر کەمال فوئاد سلاوێکی کاکەی فەللاحی پێگەیاندم، ئەو بەڵگە نامەیەکی کۆنی ساڵی1949بوو(24)، لە کۆتایی ساڵی1956ەوە تا شۆڕشی تەمووزی1958، بە هۆی باری سیاسی و ڕاونانی ڕژێمی ئەوساوە، پەنام بردەشام. لەو ماوەیەدا هەندێک گۆڕینی بنەڕەتی ژیانی کاکەی فەللاحم بیست. ئەوەبوو خۆی ووتەنی"دەسبەرداری سیاسەت بوو"(25)، بەڵام ڕووی کردە ئەدەبیات(26).

ڕەنگە نەتوانین بەرهەمی ئەدەبیی کاکەی فەللاح لەو بنەڕەتە فەلسەفییە جیابکەینەوە، کە ڕێ نیشاندەری چالاکیی سیاسیی بو، یاهۆی بونە شاعیریی بو. بەڵام ئەوەندە هەیە، کە وەک زۆر کەسی تر شەقڵی خۆ بۆ ئەدەب تەرخان کردن و لە چالاکیی سیاسیی ڕۆژانە دوورکەوتنەوە بە بەرهەمی یەوە دیارە. بەرهەمێکی هەمەڕەنگتر و فراوانتر و بەپیت تر هاتە کایەوە. ئەو بەرهەمەی لەسەر بناغەی ناوەڕۆکی ئەو یادداشت و یادگارانە بنیاد نراو دابەشکردنێکی زانستیی ژیانی شەخسی و بەرهەمی شاعیرمان دەدات بەدەستەوە کە بەم جۆرەیە.

**یەکەم:** لە ساڵی1946ەوە تا 1956.

**دووەم:** لە 1957ەوە تا ئێستا: هەر ماوەیەش تایبەتێتیی خۆی هەیەو پێوەندییەکی بەتین و چڕ لە نێوان ژیان و بەرهەمە شەخسی یەکەدا دیارە.

**پلەی یەکەم:**

هەر وەک پلەی سەرەتایە، لە هەموو سەرەتایەکی تر دەچێت و ساکاری و دروشم گەریی پێوە دیارە. شیعر لەو ماوەیەدا هۆیەکی یەکسەری تێکۆشانەو لە جیاتی سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤار و کتێب، یەکسەر دەچێتە سەر جادەوناو کۆبوونەوەی بەکلپەی خەڵکەوە.

ئەندێشەی شاعیر، لەم پلەیەدا ئەندێشەی تێکۆشەرێکەو هۆیەکە لەو هۆیانەی ئەرکی ڕۆژانەی تێکۆشانی پێ بەجێ دێنێت.

یەکێک سەرکردەی خۆپیشاندانەو یەکێک دروشمی یەکەم یا دووەم هەڵدەگرێت و یەکێک خەڵک ڕێک دەخات و یەکێک بەشدارە، فلانیش خەتیبی یەکەم یا دووەمی خۆپیشاندانەکەیەو کاکەی فەللاحیش شاعیری خۆپیشاندان یا کۆبونەوەکەیە.

شاعیر لەم پلەیەدا ئەرکی خۆی پڕ بەپڕ بەجێ هێناوە، شیعری ڕۆژانەی خۆی لەجێی خۆیدا کاریگەربووە، جا ئەو شیعرانە هەندێک جار هەر لەو شوێن و ڕۆژەدا کاردەکەن و هەندێک جار تینی ئیبداع و توانای شاعیر ساڵەهای تر بەگەرم و گوڕی دەیانهێڵێتەوە و، زۆر جاریش نرخی دەکۆمینتی(27) و مێژوویی دەبێتە شەقڵ بۆیان.

ئەگەر یەک یەک سەیری بەرهەمی ئەم سەردەمەی شاعیر بکەین(28)، لە هەر سێ بابەتەکەی تێدا دەبینین.

لە ڕووی نرخ و بایەخی ئەدەبی و ڕەخنەییشەوە لە هەموو ئەدەبیانی کوردی جیاناکرێتەوە و لەگەڵ شیعری سیاسی و شۆڕشگێریی ئەو سەردەمەدا بەیەکدا دەچن و بە مەزندەو پێوانەی شوێن و کات دەپێورێن.

ڕەنگە بتوانین لە ڕەگەزەکانی شیعر:(باس) و(بیر) و(مۆسیقا) بە ئاشکرا لەو شیعرە سیاسییانەدا بەدی بکەین. مۆسیقاکەش بە کێش و قافیە دروست دەکرێ و کێشەکەش کێشی کۆنەو دەچێتە ناو خەڵکەوە و بەگوێی خەڵکەکە ئاشنایە.

ئایا شیعری تازە بۆ خوێندنەوەی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی خەڵك دەست دەدات, بۆچ جەماوەرەکە بابەتی شیعری کۆن و کێشی کۆنی لا باشترەو ئەو زیاتر دەیجوولێنی"؟.

سەردەمێکی زۆر بەسەر تازەکردنەوەی شیعری عەرەبیدا رابورد بوو(29), هێشتا ئەو شیعرە نەچوو بووە ناو خەڵکەوە و موناقەشە لە بارەی"بۆ ئەم مەبەسە گونجان و نەگونجانی هەبوو. ئێستا ئەو شیعرە تازانە چوونە ناو خەڵکەوە, لای ئێمەش گوێی خەڵکی بە بابەتی لەوە تازە تر ئاشنابوو و خەڵکی جوولاند(30)".

گۆران شیعری سیاسیی کوردیی بەرەو پێش برد, وێنە و سۆز و عاتیفەی هاویشتە ناو, لەبەر ئەوە هێڵی بەیانیی شیعری سیاسیی کوردی بەستراوە بە گۆرانەوە. ئەمەش چمکێکی گەورەیە لە بەستنی شیعری پلەی دووەمی کاکەی فەللاح بە قوتابخانەی گۆرانەوە.

**پلەی دووەم: لە1957ەوە– تائێستا:**

ئەم پلەیەی بەرهەمی کاکەی فەللاح لە زۆر رووەوە لە پلەی پێشوو جیاوازە. بەڵام شتێکی تەواو دابڕاوو لەیەك پچڕاویش نین.

ئەو گۆڕینەی سێ کوچکەکەی شیعری ڕۆمانتیکیی کوردی(شێخ نووریی شێخ سالح و پیرەمێردو گۆران) لە شیعری کوردیدا هێنایانە کایەوە و گۆران بوو بە لووتکەو دوا چەسپێنەری, دوو ڕەگەزی زۆر گرنگی تا ئێستا ماوەتەوە و لە هەموو بەرهەمی کوردیدا دیارە(32).

یەکەمیان بە تەواوی گواستنەوەیە لە کێشی کۆنەوە(33) بەرەو کێشی پەنجەو دووەمیان گۆڕینی زمانی شیعری کوردییە بەو کوردییە پەتییەی ئێستا هەموو شاعیرەکان بە کاری دەهێنن(34).

ئەم دوو ڕەگەزە لە سەرەتاوە چوونەتە ناو شیعری کاکەی فەللاحەوە و لە ڕەگەز پێکهێنەرەکانی بوون. لە پلەی دووەمیشدا هەر بەردەوامن.

لێرەوە دەتوانین نەخشەی پلەی یەکەمی بەم جۆرە بکێشین: کێش: بەتێکرا کێشی پەنجەو هەندێك شتی کەم بە کێشی کۆنە. زمان: کوردیی پەتی.

بیر: بیری شۆڕشگێری.

دەربڕین: دەربڕینێکی یەکسەر نزیك لە(دۆان دان)(35)ەوە.

باس: مەسەلە ڕۆژانەکانی تێکوشان و سیاسەت.

بەڵام پلەی دووەمی شیعرەکانی لەسەر زەوییەکی قووڵترو بە پیتتر دامەزراوە. ئەنجامی تەجروبەی چەند ساڵەی تێکۆشان و نوشوستی و ئازاردیدەیی(واتە تەجروبەی ژیانێکی قووڵ و فراوان) تێکەڵ بە خوێندنەوەیەکی فراوانی هەمەڕەنگەو قوڵبوونەوەی هۆشیاری شۆرشگێری(بەخوێندنەوەو بە کۆششی ڕۆژانە) دەبێت و لە دەروونی شاعیرێکدا ماوەیەکی درێژ پەنگ دەخواتەوە و پاشان کە دەرپەڕی لێشاوێکی بەرهەمی هەمەڕەنگ دێتە دەرەوە.

لە شیعری ئەم پلەیەدا ساکارییەکەی جاران کز دەبێت, کڵپەی هەڵچوونە شۆرشگێرییەکەش بە هۆی باری تازەی ژیانی شاعیرەوە لە لایەك و هەر لەبەر خاسیەتی تازەی دوور لە ساکاری و یەکسەری, کەمێك دادەمرکێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدڵنیاییەوە دەڵێم کە هەمووی لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە هەر لەسەریەك هێڵەو جیاوازنییە.

شاعیر هەندێك جار دووای ئەندێشەو کێشەی ناو دەروونی خۆی دەکەوێت و موحاکەمەی دەروون دەخاتە سەر کاغەز بەڵام ئەم موحاکەمەیە بریاریشی لەگەڵدایە.

نموونەتان دەوێت:

لە پارچە هۆنراوەی.. لە فەلسەفەی ژیاندا سەرساممییەك پیشان دەدات هەموو چەشنە بیرکردنەوەی لە ژیان, بەڕاست و بە چەپدا ڕیز دەکات, لە جیهان بینیی تێکۆشەرانەوە تا چاوچنۆکیی پارەداران, تا لێکدانەوەی لاوی بەرەڵڵای ئەمڕۆبینی, سبەینێ نەزان, بەڵام شاعیر خۆی لەم گێژاوەدا لەگەڵ کێیە؟. لێرەدا هیچ نادات بەدەستەوە, ئەوەندە نەبێت کە هێڵێك لە نێوان ئەم ڕێبازانەدا دەبینێ, کورد ووتەنی بە هەشتی و جەهەنەمی یا چاك و خراپ جیادەکاتەوە, ئەم جیهانبینیانە لە سنووری دوو هەڵوێستدا دەبینێ, هەندێکیان لەم بەرن و هەندێکیان لەوبەر, بەنرخ و بێ نرخ:

**بەم چەشنە ژیان کە وەك دەریایە**
**سەدان شەپۆلی وای لەناوایە**
**سەرنجی لێدەی ئەبینی کە چەند**
**بەردی بەنرخ و بێ نرخی تیایە(36)**

بەڵام دیسان شاعیر خۆی نەدا بەدەستەوە؟ مۆری بێ نرخی بە هیچ بەرەیەکیانەوە نەنا؟ بەڵام تۆ بڵێی ئەمە بۆ شاعیرێکی وەك کاکەی فەللاح جێی گومان بێت؟ ڕەنگە خۆی بیری لەو چەشنە پرسیارە نارەوایە کردبێتەوە. هەر لەبەرئەوە کە لاپەڕەت هەڵدایەوە دەبینی شاعیر هەر لەو ساڵەدا(1961)پارچەی"بەردێك" دەنووسێت:

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاهو هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێ ئەگرم(37)

بەڵام بەردەکەی ئەم ناگیرێتە تاقە کەسێك و شێتانەش نییە, لەبەر ئەوە لە بەرقەکەی مەحوی جێگیرترە. شاعیر بەردی خۆی دەگرێتە پیاوی بێبارو, هەڵوێستی خۆی لەگەڵ تەجروبە گشتی و تایبەتییەکەدا یەکالاً دەکاتەوە:

**یەك زمان و یەك دڵ هەیە**
**خۆم بۆ تووشی هەزار ئەکەم**
**پیاوی ساغ و مەردیش ئەڵێ(38)**
**دەردی بێباری چار ئەکەم**

ئەم پارچەیەی شاعیر لە ڕوویەکی زۆر گرنگەوە جووڵاندمی, هەر ئەوە نییە کە منیش لەگەڵ ئەودا بەبەرد ڕەجمی پیاوی بێبار بکەم, بەڵکو ئەوەشە کە لەگەڵ شاعیردا چەپڵە بۆ ئەم خۆدۆزینەوەیە لێئەدەم, لێرەدا یەکخستنێکی بەرزی ڕوخسارو ناوەڕۆك دەبینم, پارچەیەکی وا, کەسۆزی دەروون و هەڵوێست دەربڕێ دەبوو کێشێکی تری درێژی بۆ بدۆزرێتەوە, بەڵام توبڵێی هەر ڕێکەوت شاعیری لەم دەربڕینەدا بردبێتە سەر کێشی(4+4) یانزیك (هەزەج)ی عەرووز, کە کێشی هەڵپەڕکێ و چەپڵە لێدانە؟ لام وانییە ڕێکەوت بێت, بەڵکو خۆشیی دڵی شاعیر لەم خۆدۆزینەوەو هەڵوێست یەکالاً کردنەوەیەدا دەیخاتە هەڵپەڕین و

چەپڵەلێدان و هەردوو بنەڕەتەکەی شیعریش لەگەڵ خۆیدا دێنێتە سەماو دەکەوێتە وێنەی جوان و پڕ ئەفراندن(ئیبداع) بەخشینی وەك:

**بەڕۆژ و شەو, بەدەست و دەم**
**"بێبار" لە تانووت بار ئەکەم**
**بەتیرو تیغی سەرزەنشت**
**ناوجەرگی کۆلەوار ئەکەم**
**هەتا ئیفلیج و گۆج ئەبێ**
**بەم چەشنە شیعرم سوارئەکەم**
**لەباتی ڕاوی باڵندە**
**ڕاوی دوپشك و مار ئەکەم**
**بۆ سەرشکاندنی وەها**
**ئارەزووی بەردو دار ئەکەم**
**هەتا"بێبار" ناچار ئەڵێ**
**لەدەس"بێباری" بار ئەکەم(39)**

وەك ووترا: ئەم پلەیەی بەرهەمی کاکەی فەللاح لەسەر چەند بناغە دامەزراوە:

1-تەجروبەی فراوانی پەنگەوەخواردوی ژیان و تێکۆشان.

2-باری تایبەتی و بەرەنگاری تایبەتیی شاعیر بەرامبەر بەو تەجروبەیەی و گوڕونوشوستی و هەڵسانەوە.

3-خویندنەوەیەکی باش و دۆزینەوەی بنەستەری(40) کەلچەریی ڕاستەقینەو پتەوکردنی دەرپەرین و دەربڕینە شیعرییە تازەکەی بەم بنەستەرە, کە ئەویش تێکەڵە لەڕەگەزی خۆماڵی و ڕۆژهەلاّتی و ڕۆژئاوایی(لەڕێی زمانی ڕۆژهەلاّتییەوە).

هەروەك پلەی یەکەمی شیعرەکانی هەڵسوکەوتی ڕۆژانەبوو لەگەڵ تێکۆشانی ڕۆژانەو ڕوداوەکانی سیاسەت و تێکۆشاندا, هەروەها بەجۆرێکی تازە سروشتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ڕوداوی ڕۆژانە یاگشتی یا شەقڵەکانی دەور و پشتدا لە پلەی دووەمی شیعر و هەمو جموجوولی بیرووناکی و کۆمەلاّیەتی و ڕۆژنامەگەریی کاکەی فەللاح نابڕێت. ژیان و تێکۆشان و پێوەندیی شاعیر بە زوربەی شیعرەکانییەوە دیارن, با لە چەند پارچەیەك بدوێین بیانکەین بە بەڵگەی ئەو بریارە.

پارچەی"هەتاکەی" وێنەی باوەڕی کوردایەتی و ڕەنگدانەوەی ئەو هەڵچوونەی بزوتنەوەی ئازادیخوازیی نەتەوەیمانە کە ئەنجامی یەکسەری ڕاپەڕینی نەتەوەیی ئازادیخوازانەی عەرەب بو, بەرابەڕیی سەرۆك جەمال عەبدولناسر. پارچە کە دیارە لە ساڵی1957دا نووسراوە.

چیرۆکی هۆنراوەی"نیرۆن" بۆکێ نووسراوە؟ باسێکی باشی هەڵبژاردووە, بەلاّم زۆر ساکار دەربڕیووە. ئەگەر ئەمە لەگەڵ ئەدەبیاتی منداڵدا چاپ بکرایە, لە ساکاری یەکەی دەبوردین, بەلاّم باسەکە خۆی لەسنووری تێگەیشتنی منداڵ دەچێتە دەرەوە.

باسی نیرۆن یەکێکە لەوباسانەی تراژیدیای جیهانی لە دەوری سووڕاوەتەوەو گەلێك"سووچ-بعد"ی نوێ و دەوڵەمەندو هەمەڕەنگی داوەتێ و لەگەڵ چەرخدا لە بەرگی تازەگەریدا تازە بۆتەوە. بەلاّم لێرەدا خامەی کاکەی فەللاح پەیی بەو قووڵی و سوچ هەمەڕەنگییە نەبردووە و نەچۆتە ناو شەپۆلی بەتینی تراژیدیایەوە.

لە"ووشکە مەلە"دا بە باسێکی تەقلیدیی ئەدەبیات, هەندێك کەس و دیمەنی هاو چەرخ دەخاتە بەردەم. هەر باسی خۆپەرستییە, یا ئاسۆیەکی کۆمەلاّیەتیی فراوانتر دەگرێتەوە و دواشت شاعیر دەنگ بۆ چاکەو ڕاستی دەدات:

**تەنها دڵسۆز و ڕاست قۆناغ ئەبڕێ**
**ئاوی دنگ ئەکوتێ ئەم ورتە ورتە(41)**

روخساری شیعرەکەش هەر تەقلیدییە, سۆز و عاتیفە دیار نیە. ڕێبازی پەندی پێشینانی پیرەمێرد دەگرێت.

ژیانی پڕ لەستەمی شاعیر, ژیانی پڕ لە ئازار, ئازاری لەش و گیان, کە دووەمیان زۆر لە یەکەم گرنگترە, ڕەنگە گەورەترین ئازاری گیان لای تێکۆشەرێك, بە ناچاری لە کۆڕی تێکۆشەران دووربون بێت. وێنەی ئەم ئازارە لای شاعیر لە ناو دێڕی زۆر شیعریدا بە چەشنی بۆ کوڕووز بەرز دەبێتەوە, بەلاّم نایگەێنێتە ڕادەی نائومیدی و بەرچاوڕەشی. لە ریزی ڕۆژانە ڕۆیشتنی کاروان دوورە, بەلاّم لە کەنارەوە لەگەڵیدا دەڕواو دوور بەدوور لەبەر خۆیەوە هەر گۆرانی بوێرێڕەوو مەبەس و ئەنجامی دەڵێت:

**کاروانە گەورەی تێکوشان**
**دەرگاو دیواری هەڵتەکان**
**قەف قەف زنجیری تێك شکان**
**هەرچەن ڕێگای سەخت و دوورە**
**لەبەر چقڵ شوێن پێی سوورە**
**لێرەو لەوێ**
**کە دەرکەوێ**
**چەتە و ڕێگر دەوری داوە**
**کاروان خڵتانی خوێناوە**
**بەلاّم بێ ترس و بێ پەروا**
**مل ئەنێ بۆ قۆناغ ئەڕوا**
**ڕاهاتووی ڕێی سەخت و دوورە**
**چ دەربەستی لوورە لوورە**
**خوێن ئەڕێژێ**
**لەش ئەنێژێ**
**لەسەرکەوتن پشت ئەستوورە(43)**

شاعیر بەدەست ئەو دورییەو هەمو کۆسپی ژیانەوە خەم دەخوات, بەلاّم گەردنی بۆ خەم نانەوێت و پتەویی لەم دێڕەدا دەگاتە بڵندی:

**ئەگەر خەم ڕۆژ و شەو دەستەو یەخەم بێ**
**ئەبێ خۆم خەم نەخۆم, خەم تووشی خەم بێ(43)**

شاعیر ئینسانە, جار و بار هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕۆژگاری ڕەش و پیاوی بەددا وای دەهەژێنێ کە ڕەنگی ڕەش بێتە کەرەسەی هەندێ تاڵی وێنەکانی, بەلاّم لە ئەنجامدا و لەسەر هەموو تابلۆ یەکگرتووەکانی هەر گزنگی خۆر و سپیدەی بەیان دیارەو شاعیری هیوایە(44) بالە هەندێك پارچەشدا بۆ کرووزی دڵێکی بڕژاویش لە شیعرەکانی هەڵسێت:

**کە هەناسەی من وەك بای خەزان بێ**
**زەردەخەنەی لێو ووشکە گریان بێ**
**وەك یەك بنوێنێ بەهار و پاییز**
**دەبا وەرزەکەم گەلاّرێزان بێ(45)**

لێرەدا, لەم مەیدانە دێینەوە سەر پارچەی فەلسەفەی ژیان کە وێنەی فەلسەفەی شاعیر نیە. چونکە ئەگەر ئەمە وێنەی گشتیی شاعیر بێت, ئەوا نابێت بە ئاسانی بەسەر فەلسەفەی ژیانیدا ڕاببوورین. شاعیر لەوێدا وێنەیەکی کێشەی ژیان و دەستەو چینەکانی کۆمەڵی پیشانداوە, بەدەم هەموویانەوە, یا بەدەنگی هەموویان, لە ژیان و فەلسەفەی ژیان دوواوە, لێرەو لەوێ قسەو تەوس و ڕای دەربارەی ژیان دەربڕیووە, بەلاّم خۆی نەداوە بەدەستەوە دەگونجێ دوا چوارینی کە لەسەرەوە نووسرا بە بریار دابنرێ. دەبوو شاعیر بەردە بەنرخەکانی بکردایە بەبناغەو بە دروست کەری مەڵبەندی ژین و بەردە بێنرخەکانی ووردو خاش کردایەو دوو دێرێکی وەك چوارینی(9,8,7)ی بخستایە دوواوە و لە کۆتاییدا بیووتایە:

**-هەندێکیش ئەڵێن ژیان خەباتە**
**ڕێی پێشکەوتنی گەل و وولاّتە**
**"پەروانە" پەروای سووتانی نییە**
**بەرەو ڕووناکی گیانی خەلاّتە(46)**

یا لە جیاتی لێرەدا بڵێت"هەندێکیش ئەڵین بیووتایە:"منیش ئەڵێم" یا"ئێمەش دەڵێین".

بەڵێ... لەبەر ئەوە ئەم حسابە ووردە لەسەر ئەم پارچەیە لەگەڵ شاعیردا دەکرێت, چونکە پارچەکە خۆی لە ڕووی شیعرییەوە هەر ئەوەیە"کێش و قافیە" بۆ ڕاوقسەکان دروست کراوە و دەچێتە ڕێزی هەندێك لەو ئامۆژگارییانەی شاعیرە"زانست پەروەرەکان" نوسیویانە, یا ئەگەر بەهایەکی گەورە تری بدەینێ دەیبەینە ریزی"پەندی پێشینان"ە کانی پیرەمیرد. هەر لەبەر ئەوەیە شاعیر دەیتوانی کۆمەڵێ ڕای تریش ڕیز بکات و لە هەڵوێستی کۆڵنەدان و تێکۆشەرانەوە بۆ فەلسەفەی ژیان بچووایە.

خۆئەگەر پارچەکە وەك گەلێك پارچەی تری شاعیر سۆزی دەروونی پێوە دیار بووایەو لە زادەی هەژاندنێکی ڕاستەقینەی شاعیرانە بچووایە, ئەوا هەقی ئەم چەشنە حسابەمان نەبوو و نەماندەتووانی داوای زیادکردنی یەك ووشەی لێبکەین, بەڵکو ئەوکاتە بەزادەی تاوێکی ڕەش بینی و نائومێدی دادەنرا. بەلاّم دەبێ حسابەکە لەوە گەورەتر بێت و بچێتە ڕیزی ئەو هێڵی ژیان و بەرهەمەوە کە بۆ شاعیر نەخشە کێشراوە.

هەر بەدەم ئەم حسابەوە دەبێ بچینەوە سەر پارچەی"هەناسەیەك" و "بپرسین کامەیە" "گوڵی ژاڵە"ی(47) شاعیر.

دەبێ چ تەجروبەیەك ئەم قسانەی بە شاعیر کردبێت؟ شتێکی تایبەتیی خۆیەتی لەگەڵ دڵدارێکدا؟ یا تەجروبەی خۆیەتی لەگەڵ بارێکی گشتی و ڕێگەو بانێکدا, نایشارمەوە کە کۆنەپەرستان وورتە وورتی ئەوەیان بوو و دەیانویست پارچەکە بەم جۆرە بخەنە سەر بەرهەمی پووچەڵی خۆیان, بەلاّم شاعیر بە دڵنیاییەوە ئەوەی بەدرۆ خستەوە.(48) هەر چونێك بێت ئەمە دەمانخاتە سەر ئەوەی بەرەمز بەکارهێنان لە ئەدەبیاتی ڕەمزی جیابکەینەوە. ئەم چەشنە ڕەمزییەتەی شاعیر دەبێتە هۆی لێکدانەوەی جیاجیا ئەگەر ئەدەبیاتی ڕەمزی بە گشتی ناوەڕۆکێکی کۆنەپەرستانەی دوور لە واقیعی هەبێت. ئەوا ناتوانرێ ئەم پارچەیەو هەندێك پارچەی ڕەمزیی شاعیر بخەینە ئەو خانەیەوە. بەلاّم بە کارهێنانی ئەو ئوسلووب و کەرەسەیە لە باریدا هەیە کە لێکدانەوەی وا دروست بکات, کە نابێت لە هیچ بەندێکی ژیان و بەرهەمی شاعیرێکی ریالیستی پێشکەوتنخوازی وەك کاکەی فەللاحدا شتی وا تۆمار بکرێت. هەر لەبەر ئەوە لە ئەنجامی ئەم پارچە ڕەمزییانەدا(49), هەر دەچینەوە سەر لایەنی چاکبینی و ئەم دێڕە بڕیارو بەڵگە بۆ شاعیر دادەنرێ کەدەڵێ:

**سەردەمێکی باش وون ئەبی, دەروونم تاسەی تۆ ئەکا**
**جار جار گوڵی بەهارەکەم یادی هەناسەی تۆئەکا(50)**

بۆ سەرکەوتنی ڕەمز پێشاندانیش"لەگەڵ شەپۆلەکانا" دەبێتە نموونەو کاتی باس کردنی دێت.

زۆر لای پارچەی"بەستەی جەنگاوەرێکی نەناسراو"(1971) وەستام ئەم پارچەیە بەستەیە, گۆرانییە. شاعیر بە مۆسیقاو کێشی فۆلکلۆر ئامێز سۆزێکی دروست کردووەو دووای ئەو جەنگاوەرەت دەخات. خۆیت پێ دەناسێنی, هەموو مەسەلەکەو ئازایی و مانەوە و فیداکاریت پێشان دەدات. لە دەروونی خۆیەوە بەرەو گەلی کوردت دەبات و لە چوارچێوەی شۆڕشی جیهانیدا دەگیرسێتەوە هەر وەك گەلێك ووشەی بەکارنەهێنراوی خۆی و وێنەی تازەی ڕێگەی پڕ(دڕك و چقڵ)ت بۆ نەخشە دەکێشێ. هەستی خۆی و خۆناسی ئایدیۆلۆژیی خۆیت دەخاتە بەردەم. ڕاستیی یەکگرتن و پێکەوەلکانی:"شاعیر- گەل- جیهان)ت بۆ دەردەخات.

لێرەدا لەگەڵ شاعیردا یەك دەگرینەوە و دەبێ هەروا بمێنینەوە و پێکەوە بڕۆین.

"کارەساتی ئادەمیزاد", یەکێکە لە مەسەلە گەورەکانی ئەدەبیاتی جیهان بە تراژیدیاو کۆمیدیایەوە, دەپرسین کوا ئەو کارەساتە لە شیعری کاکەی فەللاحدا. ئەی ئەم هەموو پێوەندی یە بە ژیان و خەباتو خەڵکەوە ڕەنگدانەوەی چین؟ ئاوێنەی چین؟ دەچنە چ خانەیەکەوە؟.

کەرەسەو هەڵسو کەوت لەگەڵ کەرەسەداو بەکارهێنانی کەرەسەکە پا بەستە بە شێواز و دەسەلاّتی شاعیرەوە.

زۆرجار کاکەی فەللاحمان لە ریزی قوتابخانەی گۆراندا جێکردەوە جێی دیارمان دایە. بەلاّم چەند شاعیر بە قوتابخانەیەکەوە ببەسترێت, شێوازی خۆی نەبێت, هەر لاسایی کەرەوەیە.

زۆرجار بۆ ئەوە دەچم کە شاعیر لە سنووری"قوتابی" و"لاسایی کردنەوە" نەبەمە دەرێ, بەلاّم زۆرجار شێوازەکەی شاعیر خۆی شەخسیەتی تایبەتیی شاعیر دەردەخات.

نمونە: پارچەی"یادێکی25ساڵە"(1975) کارەساتێکی ئینسانییە, ڕەگەزی کۆمیدیا دروست کردنیشی تێدایە.

کۆمیدیایەك گاڵتە بەرژێمی ناپەسندی ناهەمواری نائینسانی بکات.

ئەم کەرەسەیە لای گۆران بووایە, دڵنیام کە"پیەسێکی تەمسیلی" کۆمیدیی تازە دەچووە سەر"جق و نق" و"جۆقی یۆنسکۆ"و... هتد(51). بەلاّم کاکەی فەللاح چۆتە قووڵیی زامەوە و کارەساتی ئینسانێکی دەربڕیوە:

**تا لەو کونچی زیندانە خۆی بخواتەوە**
**بە فرمێسك چڵکی ستەم بشواتەوە**

***

**ئەو دەمەش ڕێکەوت وابوو**
**مناڵێکیان لە خەوا بوو**
**هاواریان کرد: بابە, دایە**
**ئاگرمان تێبەربوو خوایە(52)**

ئەم چەند دێڕە کۆتایی پارچەی "چوار مناڵەکە" "یە کە ساڵی 1964 نووسراوە و شاعیر لە ژێریدا نووسیوییە "ئەم شیعرە زۆرە هەر ئەوەندەی ماوە".

دەبێ کەمتەرخەمی لە بەدوادا نەگەڕاندا هەبێت. یا ئەو کارەساتی چوار منداڵە کە کارەساتی گەلێکە، دیمەنی چەرخێکە، تاڵێکی گەورەیەو لەو ساڵەشدا واتووند شاعیری بەنەتەوەو چەرخەوە بەستووە.

دەبێت شاعیر نەتوانێت دیمەنەکان، ئامادە بکاتەوە، یا کورد ووتەنی بیانهێنێتەوە بەرچاوی خۆیو هەستی خۆیو هەڵوێستی یان تێکەڵ بکاتەوە کە هەر هەستو هەڵوێستەکەی جارانن.

پارچەکە بەئاوایەکی تریش بێت دەبێت تەواو بێتو لە پاڵ هەموو سووچێکی پێوەندییەکانیدا، دەبێت بێتە تۆمارى ساڵێکی تری مێژوومان.

***

**چەند بریارێکی تر:**

–پارچەی دوێنێو ئەمڕۆ– چەند شەخسیەتی تایبەتی شاعیر خۆیی تێدا بێت، هەر چمکێکە دەیبەستێ بە "ع. ح. ب"ی شاعیرەوەو لەگەڵ ئەودا لە مەیدانی فراوانی شیعری گۆراندا یەك دەگرنەوە(53).

–چوارچێوەی فراوانی ئایدیۆلۆژیی شاعیر دیارە، نموونەی زۆر هێنانەوە دەبێتە دووبارە کردنەوەو پەسەندیی ئەو چوارچێوەیە، کەلە خۆیدا ساکارییە. ساکارییە بنووسین شاعیر باوەڕی بەسەرکەوتنی هەق، رووخاندنی زوڵمو زۆر هەیە. بەڵام باخشتێکی زێرین بکەین بەنموونەو لەسەر ئەو تەلارە فراوانەی دانێین.

نرخی ئەو خشتەش لەوەدایە کەلە دەروونی خەڵکەوە هاتووە، ژیریو باوەڕی نەلەقیووی هەزار ساڵەی خەڵکەکە نەقشی مێژووەو حەتمیەتی ڕیرەوەو تەجروبەی هەزاران ساڵی ڕاستیی دەسەلمێنێت. شاعیر بەدوای خەڵکیدا ووتوویەتی:

**گەرچی باوەڕم وایە (کاسە پڕبوو لێی ئەڕژێ)**

**کاسەی خوێنی ڕژاوی ناهەق پڕو لێوانە**

**بەگەرمیی خوێنی ئاڵی جوانەمەرگی خێرنەدیو**

**ئەسووتێ تەختو بەختی ئەوەی کەوا تاوانە(54)**

لێرەدا چۆتە سەرپەندی پێشینان (کاسە کە پڕ بوو لێی ئەرژێ)، هەروەك لە خانەی روخسارو جوانیدا جێی کردۆتەوە، هەروەها دەچێتە خانەی ناوەڕۆكو پێوەندیی ئایدیۆلۆژیشەوە.

–ئەی هاوسەری من "پارچەیە کە شاعیر لە فارسییەوە وەریگرتووە" بەڵام نەینووسیووە لەکوێوە وەرگیراوەو خاوەنی کێیە؟ دەست نیشانکردنی ئەمە زۆر گرنگە.

چونکە پارچەکە لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ پارچەی "هەڵوبەگ"ی گۆراندا(55) بەراورد دەکرێت تاڕاستیو ساڵی نووسینی پارچە فارسییەکە نەزانین، پێش بینی جێی خۆی ناگرێت.

–کاکەی فەللاح وەك زۆربەی شاعیرانی کوردی پاش مەولەوی لە سروشتی کوردستان ئیلهامی وەرگرتووە، ووشەو وێنەو ڕەنگی گوڵی هەڵێنجاوە، بەڵام سروشتەکەی کاکەی فەللاح وەك زۆربەی ئەو شاعیرانە سروشتێکی بێگیانی تاقەوە بوونییە، ئادەمیزاد لەو سروشتەدا جێی خۆیی هەیە، لای ئەویش گوڵاڵە سوورەی ئەم دەشتە خوێناوی جگەرتانە(56). مرۆڤی کورد لە گەرمەی بەهارێکی تازەدا "دڵێکی کۆست کەوتوو"ە، هەڵپەرکێی تازە "لاسایی نەبوو"ش هەر دەستکردی ئەو خوێنی جگەرە بوو، مرۆڤی کوردی ئەو بەهارە تێکۆشەری کوردی بەهار هێنەر بوو.

**ئێوەن بەخوێنی گەش گوڵی ئازارو نەورۆز ئاوئەدەن**

**گەوهەری یادگاری کورد بەبڵێسە زاخاو ئەدەن**

**بۆ خاکی تێراوی خوێن و تینووی نەورۆزی یەکجاری**

**بۆ کاروانی ڕێ ئاگری ئاسۆی رووناکی ڕزگاری(57)**

–یادی ئاوابوونێك (1971) گۆرانی شاعیر لای کاکەی فەللاح ئەچێتە قاڵبی ڕاستەقینەی خۆیەوە، بەڵی دەست بۆ هەموو هونەرو هەموو وێنەی جوانو هەموو ناوونیشانی شیعری یەسۆزی درێژ دەکات. ئەو گۆرانەیە (کەتا ئەم دنیایە مابێ) (خۆری گەرمی بلیمەتیی ئاوا نابێ) بەڵام گۆران ئەو قارەمانەیە کە سڵی لە دەردو ئازار نەکردەوە:

**بۆ ئارەقێ ڕژا بەسەر دڕكو داڵا**

**بەسەر زامی ژیانی ناسۆرو تاڵا**

**بۆ هەڵبەستێ: هەوێنی گەرمەی شۆڕش بوو**

**بروسکەو گرمەی ناڵینی پێش هێرش بوو(58)**

–یادێکی 25 ساڵە (1975) نیشانەی بەرزبوونەوەی شاعیرو دەسەڵات بەسەر باس دەربڕینا پەیداکردنە. کێشەو ئەندێشەو ئازاری مرۆڤێك، چەوتیو خواری وایێنەهاتوویی ڕژێمێك، دەبێتە کارەساتێكو گەلێك وێنە. شاعیر لەوزەی دەربڕینیان دێتو تابلۆیەکی تازە دەبەخشێت بەشیعری خۆیو شیعری کوردی.

–لە ئەلبوومی هەڵبەستێکدا شەش وێنە (1976). ئافرەت لای شاعیر ئینسانە (دوا پلەی ئافرەت لە شیعری کوردیدا شاعیریش بۆ ئەو سۆزە بابەتێکی تازە تر دەبەخشێت بەشیعری خۆی.

–لە پاڵ کێلێکدا (کۆتایی 1977)، دیسان بابەتی تازەیە چەند دەنگێك دێتە ئاخاوتن، وێنە دێرینەکانی شیعری کلاسیکیمان گوڵو بولبول، شەمو پەروانە دەباتە لای ئاگرو سەمەندەرو دیسان وێنەی ڕاستەقینەی ئادەمیزاد زاڵ دەبێتو کارەساتەکە دەبێتە کارەساتی مرۆڤی ئەم سەردەمە. وەلی دیوانەو شەم، خاتوزینو کاکە مەم دەبنە مرۆڤی ئەمڕۆو ڕاکشاوی ئەو خاکەو:

**وەك چەخماخەی هەوری ژانگرتووی بارانێ**

**رووناکی خستە ناوەوە.**

**وەك تریفەی مانگە شەوی دەمەو بەهار**

**شەپۆل، شەپۆل، تیشکی ئاسۆی ئەرخەوانی**

**پرشنگی ڕشتە گلێنەی**

**چاوەکانی چەوساوەوە**

**چاوەکانی چەوساوەوە(59)**

***

بەگۆرستانی سەیواندا بگەڕێت هەر ماتەمو گریانت بۆ نامێنێتەوە. بەڵکو زۆر لە کێلەکانی گۆرستان دەبنە بەڵگەی مێژوویی و(60) شوێنەواری ئەدەبی بەجێ دێڵن.

لێرەدا بۆ باسی ئەدەبیات هەر لە سەیوان دەدوێین، چونکە ئەم دیاردەیەی لێی دەدوێین، لایەنە نەتەوەییەکەی لە سلێمانیدا لە هەموو شوێن زیاتر خۆی دەنوێنێ.

هەر سەرکێلە چوارینێکی لەسەر هەڵکەندراوە، هەندێکی ساکارو ئاساییو هەندێکی لەنگو لەشیعر نەچوو، بەڵام هەندێکی سۆزی ڕاستەقینەو ڕاستگۆیی ماتەمو وێنەی قووڵی مەرگو کارەساتو شەهیدبوون پیشان دەدەن.

زۆر دەمێکە هەر لە سەیوانەوە ئەم دێرەی هەردی هاتۆتە سەر زمانی لاوانو بەسۆزەوە دەڵێن:

**بای ئەجەل هاتو لە ناکاو دەفتەری ژینی دڕیم**

**تاکو دوێنێ خونچەبووم ئەمڕۆ بەناحەق هەڵوەریم(61)**

سەرکێڵەکانی سەیوان کەشکۆڵێکی شیعر پێك دێنێ، کەرەسەیەکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئەدەبی بەردەست. بۆ ناوی شاعیریش: لەسەر گۆڕی هەندێك شاعیر شیعری خۆیان نووسراوە، لەسەرکێلی تر شیعری شاعیرانە، کەلە هەموویان لە پێشتر بێخودە(62)، هەردیی بەرهەم کەمیش بەسەر چەند کێلێکەوە شیعری هەیە.

کاکەی فەللاحیش یەکێکە لەو شاعیرانەی پەری ڕەنگینی بەرەنگی ڕەشی ماتەمو خۆڵەمێشی‌ی دووکەڵو سپی‌ی فرمێسکو سووری شۆڕش لە زۆر پەنای سەیواندا نەخشەی شیعری کێشاوە.

ئەم شیعرانە هەندێك جار هەژانو جووڵاندنی شاعیر خۆیەتی لەگەڵ کارەساتێکدا، هەندێك جار داوای کەسو کاری مردووە، جایا لەگەڵ ئازاری کەسو کارەکەدا دەجووڵێتو دوو دێڕی جوان دەچێتە سەرکێلێك، یا هەر شتێکی ساردو سڕی تەقلیدی دێتە کایەوە.

دەتوانین هەندێك دێڕ بکەینە بەڵگەی سۆزو سەرکەوتنی کاکەی فەللاح:

**هەر کە دەردی سەرەتان پەنجەی گیر بوو لە خوێنم**

**زانیم ئەم ئارامگایە وا زوو ئەبێ بەشوێنم**

**بۆ یادی جوانەمەرگیم بەفرمێسكو خوێنی دڵ**

**لەم سەر گۆڕە بەهاران گوڵی (لاولاو) ئەڕوێنم**

***

-لەمەوبەر باسی "یادی ئاوابوونێك"مان کرد، کە بەڵگەی پێوەندیی دڵو شیعری کاکەی فەللاح بوو، بەڵام دەبێ بچینەوە سەر پارچەیەکی تری شاعیر کە ناوی ناوە بۆ "گۆران"ی نەمرو ئەنجامی پێوەندیو قووڵ بوونەوەیە بەشیعری گۆرانداو بەڵگەو خۆناسی سەر بەقوتابخانەی گۆران بوونی شاعیرە. بەڵام وەك زۆر لەو شیعرانەی بۆ مەرگی گۆران وتراون نەیجووڵاندم.

نازانم شاعیر خۆی نەیتوانیووە سۆزی دەروونی بخاتە ناو دێڕی شیعرەوە. یا سۆزو عاتیفەی من بەرامبەر بەگۆرانی مامۆستاو هاوڕێ ئەوەندە بەکوڵە، کە تا ئێستا بەشاعیران دەرنەبڕڕابێت.

***

نابێ بەسەر ئەو پارچە شیعرەدا ڕابوورم کە شاعیر بەناوی شیعری "عەلای تەرمۆکی"یەوە وەریگێڕاوە. شاعیر وورشەیەکی داوە بەشیعرەکان، ئەگەر شیعرەکان هەبوونایە، ئەوا ئەم داڕشتنەوەیە بەزیندووکردنەوە دەژمێررا. بەڵام وەك دەزانین نەشیعری عەلی تەرمۆکی هەیەو نەپێش هەزار ساڵ شاعیرمان بەو ناوەوە هەبووە.

عەلای تەرەماخی لە سەدەی دەیەمو یانزدەهەمی هیجریدا ژیاوە، کتێبێکی بەناوی "علمی صرفی کوردی"ەوە(63) نووسیوە.

ئەم شیعرانەی لە کتێبێکدا بەفەرەنسی دروست کراون. واتە تێکستە کوردی‌یەکانیان لەوێشدا تۆمار نەکراون، ڕەفیق حیلمی ئەو کتێبەی کردووە بەعەرەبی(64) چ کاکەی فەللاحو چ هەندێك شاعیری تر عەرەبی‌یەکەیان کردۆتەوە بەکوردی.

قووڵ نەبوونەوەو شارەزانەبوون لە ئەدەبیاتی کوردیدا وای کردووە کە هەندێك کەس تەنانەت قوتابخانەیەکی ئەدەبی‌ی نەبوو بۆ عەلای تەرمۆکی دروست بکەنو هەزار ساڵ تەمەنی بدەنێ(65).

***

گەلێك چمکی بەرهەمو تێبینی کاکەی فەللاح بەسامانی نەتەوەیی ئەدەبیاتەوە دەبەستێت. ئەمە هەر وەك لە تێکڕای ڕوخسارو ناوەڕۆکی شیعرەکاندا دیارە. لە هەستی قووڵ دەربڕین، یا بەشیعر نووسین بڕیاری ڕەخنەگرانە بەسەر ئەم شاعیرو ئەو شاعیردا دان، یا بەگەشتی شاعیرانە بەبەرهەمی شاعیرانی ڕابوردووداو دێڕی ماتەم بۆ هەریەکەیان تۆمار دەکات. با دیسانەوە بەدیوانەکەی شاعیردا بکەوینە گەشت:

-پارچەی مەولەوی: زیاتر وەك ڕەخنەگرێك لە شاعیر دەدوێت، هەرچەند هەندێ جار بەوەسفێکی دەرەوە لە شاعیریش ئەدوێت "مەولەویی دانا" "عیززەتی نەفسی بڵندی"، "بۆ خۆی هەژارو دڵ دەوڵەمەندی" "چاو- تێری و برسێتی‌ی حاڵی" "ڕەوشتی بەرزی".

بەڵام بۆ شیعرەکانی: "هەڵبەستی ناسکی دانا" "ناسکی‌ی خەیاڵی جوانی" "سۆزی ڕوونو ڕەوانی" "گەرمی‌ی هەستو ساردیی هەناسەی" "بەهرەو سەلیقەی" "قووڵی ئەندێشەو هۆشی"، "سنعەتو ووردەکاری" "شیعری تەڕو پاراوی".

-لە یادی "شێخ سەلام"دا (1969) دیسانەوە لە کلاورۆژنەی مەولەوی بینینەوە ئەمیش دەبینێت. تۆماری نووسینو شیعرەکانی دەکات، چەپڵە بۆ هەندێك بەرهەمی لێدەداتو خەتی ڕاستی‌ی بەسەردا دەکێشێت. بەڵام تەنانەت کەدێتە سەر باسی ملەکەوەی شین هەڵگەڕاوی شێخ سەلامیش، نەسۆزەکەی شێخ سەلام بەتەواوی خۆی دەنوێنێت. نەسۆزی شاعیریش بەرامبەر بەشێخ سەلام دیارە.

وەرگێڕانی هەندێك لە چوارینەکانی بابەتایەر. دیسان نیشانەی پێوەندی‌یە بە "سامانی نەتەوەیی" ئەدەبیاتەوە، توانای تێگەیشتنو تێکەڵ بوونە لەگەڵ ئەو سامانە شێوەی وەرگێڕانەکە بڕیاری زانستیو کوردە لەسەر ئەوەی بابە تایەر کۆنترین شاعیری کوردە. وەرگێڕانەکە کەرەسەی زانستیو بەراوردی زمانو دوو دیالێکتی لوڕیو کرمانجی‌ی خواروو دەدات بەدەستەوە.

-شاعیر لە پارچەی "کاروانی ووشە"دا (1970) زۆر ووردترو مێژوو بین تر دەچێتەوە سەر مەسەلەی سامانی نەتەوەیی ئەدەبیاتو لە باری سرنجی ڕاستی ڕیالیستانەوە ڕابوردووی گەشی ئەو سامانە بەئێستاوە دەبەستێت. یا دیمەنی گەشی ئەو سامانە بەبناغەی پتەوی ئەدەبیاتی سەرکەوتووو پێشکەوتووو پێشکەوتنخوازی کوردی دادەنێت.

بەکێشی تازە، بەکۆکردنەوەی زۆر ووشەی کوردیی تازەی خەرمانی زمانی ئەدەبیاتی ئێستامان ئەو بیرە دەردەبڕێت:

**ئەڵێ: مەردی‌ی باخەوانە**

**کە یەکێتی‌ی ئەدیبانە**

**یەکێتی ئەدیبانی کورد**

**کاروانی ووشەی جوانی کورد**

لێرەشدا هەر بۆ سۆزو عاتیفە دەگەڕێم، باباسەکە پتەوی و سامانی ووشەشی زیاتر بوێت.

زۆر جار پارچە شیعرێك دەبێتە هۆی دانانی کۆمەڵە پارچەی تر. چ لە بیرو ناوەڕۆکدا بێت، چ لە ڕوخسارو کێش و داڕشتندا بێت، هەندێك پارچەی تری لێ پەیدا دەبێت. شاعیران هەوڵی دروست کردنی ئەو بابەتە دەدەن. ئەمە لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا "موعارەزە- معارضة"ی پێ دەڵێن. لە ئەدەبیاتی کوردیدا نموونەی ئەمەیان هەیە. بەڵام کەمە. پارچەی "ئەو گەلەی" کاکەی فەللاح تەواو لەو بابەتەو لای من لەگەڵ "میللەتێك"ی بەختیار زێوەردا یەك دەگرێتەوە.

ئەم دیاردەیە لە ڕوانگەی تازەگەریەوە بەلاسایی دادەنرێت.

بەڵام لەڕووی سامان گەریی ئەدەبیاتەوە بەڵگەی داچەسپاندن و یەکێتی و پێوەندیی ئەدەبیاتی هاوچەرخمانە.

شاعیر هەر لەم پارچەیەدا ڕێ و شوێنێکی کۆنتر تازە دەکاتەوە. ئەویش هێنانەوە کایەی دیمەنێکی تری پێوەندیی نێوان ڕۆژنامەگەریی کوردی و شیعری کوردییە.

شاعیر ستایشی ڕۆژنامەی کوردی دەکات مەسەلەی زمان و گەل و پێشکەوتن لە گۆڤارێك، ڕۆژنامەیەکدا کۆ دەکاتەوە. هەست و ڕاستی دەردەبڕێت.

ئەم پەیڕەوە پەسەندە، زیندوو کردنەوەیەکی تازەگەرانەی دەوێت.

-کاکەی فەللاح لە "یادی 20 ساڵەی کۆچی پیرەمێرد"دا شیعری ووتووە.

ئەم شیعرانەشی دەچێتە پاڵ باسی "مەولەوی"و "شێخ سەلام"و هەر ئەو ڕێبازەی تێدا گرتووە پیرەمێردو بەرهەم و نووسین و ژیان و قەلەندەرخانەی.. هتد.

بەکێشێکی درێژ، کە دەتوانین بەیەکخستنی چەشنی "موستەزاد"و کێشی کوردیی دابنێین لە جیاتی دەپەنجە (5+5)، دەبێتە 15 پەنجە یا کەرت (5+5+5).

قافیەیەکی جیاواز لە زۆربەی شیعرەکانی. چەند چوارینی جیاجیا بەڵام (یەکەم و سێیەم) (دووەم و چوارەم) یەکدەگرنەوە.

ئەمانە ئیبداعن لە ڕوخساردا، بیریش تێکڕا دیارو ڕاستەو شارەزایی شیعری پیرەمێردیش هەر دیارە. لەگەڵ ئەوەشدا تارمایی "شینی بێکەس"ی گۆران خۆی دەنوێنێ. بەڵام فرمێسکە بەکوڵەکەی گۆران بۆ پیرەمێرد دیار نییە. ئەمەش دەبێ وابێ و مەسەلەی دوورو نزیکیی چەند لایەنەی هەر چوار شاعیر هۆی ڕاستیمان بۆ دەردەخات.

کەواتە دەبوو شاعیر خۆی نەباتە سەر باسی فرمێسك، چونکە تەنانەت گۆرانیش لە دوو شینەکەی بێکەسی زوو بەخاك سپێرراودا فرمێسك دەڕێژێت، بەڵام بۆ پیرەمێردی دوو ئەوەندەی ئەو ژیاو لە ژێری دەگەڕێت.

جا، دەبێت هەر ووشکیی باسی "سامانی کۆن" بێت، ئەو سۆزەی لە شیعری کاکەی فەللاح بڕبێت. یا نەبوونی ئەو پێوەندییە عاتیفییە نزیکە بێت لەگەڵ ئەو شاعیرانەدا ووشکییەکی داوە بەم باسانەی شیعرەکانی؟. ئەگەر لە باسی مەولەوی و سەلام و پیرەمێرددا عاتیفە دەبێ نەبێ و دروست نەکرێت. خۆ بۆ گۆران دەبوو عاتیفە سەر بکات و هەموو شت داپۆشێت؟. کەواتە یا هۆی یەکەم ڕاستە. یا شاعیر ئەسپی خۆی لەم مەیدانەدا باش پێ تاو نادرێت؟.

ئەمەش ڕەنگە لای هەندێك ڕەخنەگر، لایەنی پتەوی بن و پتەویی شیعری کاکەی فەللاح دەربخەن و لای هەندێکی تر لایەنی کزی بن. چونکە شیعر لە پاڵ ئەو مۆسیقای ووشە ڕیزکردن و قافیەی جوان دۆزینەوەیەدا زۆر جار بەبێ سۆز خوێنەرو گوێگر ناجووڵێنێ.

باسی کاکەی فەللاح و پیرەمێرد: بابەم پارچەیەش دەست پێ بکات، بەڵام جوغزێکی فراوانی کارتێکردن و بەراورد دەگرێتەوە.

چاپکردنەوەی پەندی پێشینانی پیرەمێرد. چەند ساڵێك دەرکردنەوەی "ژین"ی پیرەمێرد بەناوی کاکەی فەللاحەوە، چوونەوە چاپخانەکەی پیرەمێرد (بێ قەلەندەرخانە)کەی، ناونانی ئەو کتێبخانەیەی سەردەمێك هۆی ژیانی شاعیر بوو بەناوی پیرەمێردەوە. ڕەنگە هەر قسەی خۆش نەبێت ئەگەر بڵێین "وابزانم بشمریت قەبری گردی سەیوانت ئەوێ"ی ئەسیری لای ئەم بێت بەگردی یارەو تەنیشت پیرەمێرد. ئەمانە هەمووی شتی سەپێیی و سەر ئاوەکی نین. بەڵکو قووڵی و فراوانییەکی باسکردنی دەوێت. هەرچەندە کاکەی فەللاح لە کۆڕی ڕەخنەدا بەڵگەیەکی جیاواز دەدات بەدەستەوە(67).

**سۆزو شاعیر:-**

وەك لەمەوپێش دیارە، زۆر بۆ سۆز گەڕاوم لە شیعری کاکەی فەللاحدا. وا لە هەندێك شوێندا دۆزیمەوە. "بۆ هیوای خوشکەزام- 1974".

سۆز هەر ئەوە نییە ئەنجامی هەژینی شاعیر خۆی بێت. بەڵکو ئەوەی خەڵکیش بهەژێنێت.

زۆر جار هەموو کەس هەست بەقرچەی جەرگی برژاو دەکات، بەڵام ڕەگەزی سۆزەکەی پێ دەست نیشان ناکرێت. لەمەدا خوێنەرو ڕەخنەگریش یەك دەگرنەوە.

دەتوانین بەم چاوە سەیری پارچەی ناوبراو بکەین. کەرەسە هەر ئەو ووشە ئاساییانەیە کەلە شیعری تری کاکەی فەللاحدا بەدی دەکرێت. کێش یەکێکە لەو کێشانەی کاکەی فەللاح کە زۆر لە خۆت بکەیت، کێشێکی عەرووزی بۆ دەدۆزیتەوە. بەڵام باشتر ئەوەیە هەر بیبەیتەوە سەر کێشی پەنجەو ئەم ناوەی لێ بنێیت (4+4+4+3)=15.

هەندێك ووردە شتی تایبەتیی هیوای جوانەمەرگ "قەڵەم و دەفتەرو کتێبی ناو جانتا"، "وێنەی تازەگیراوی". ئەمانە لە ژیانی ڕۆژانەدا زۆر ئاسایین. بەڵام دیارە کە تێکەڵ بە "جل و بەرگی خوێناوی" بوون. دەبنە یادگاری نەمری "تێبەربوو"و دەبنە "کۆستی نوێ"و دەچزێن بەسەر دڵمانا"، بەسەر دڵی هەمووماناو ئێمەش لەگەڵ ناسۆری شاعیردا دەژین. دەچینە سەر ئەو سۆزەی بەدیمان کرد. بەڵام هێشتا سۆزەکە لەوە قووڵترە کە بەم ڕەگەزەووردانە دەست نیشان بکرێت.

پارچەیەکی تری- دیاری توێیە (1974)، بۆ ئاودێری جگەرگۆشەی لووتکەی سۆزی ڕاستەقینەی شاعیرە، لووتکەی ڕاستگۆیی و تەجروبەی شیعری ئەوەو لووتکەی ناسینی ڕاستییەتی.

شیعر چەند جوان بێت، بەپێکەنینی منداڵێك، بەگریانی منداڵێك ناگات:

**خۆت ئەو شیعرەی لە دیوانی ژیانی منا**

**ئەو گەوهەرەی لەبن دەریای هەستی بێبنا(68)**

**شتێك دەربارەی ڕوخسار:-**

ڕوخساری شیعر لای کاکەی فەللاح تێکڕا روخساری قوتابخانەی گۆرانە. کێش کێشی پەنجەیە، زۆرتر هەشت پەنجەیی (4+4)، یا دەپەنجەیی (5+5). بەلاّم شاعیر خۆی لە هەندێك کێشی عەرووزیش لانەداوە، بەتایبەتی هەزەج و ڕەجەز کەلە ژماردنی کەرتەکانیاندا لەگەڵ کێشی پەنجەکەی خۆماندا یەك دەگرنەوە.

قافیەش لای شاعیر وەك سروشتی ئەو قوتابخانەیە زۆرتر هەر قافیەی مەسنەوی‌یە، بەلاّم شاعیر خۆی لە قافیەی یەکگرتووی شیعری عەرووزیش لانەداوە، بۆ نموونە: لە پارچەی "بەسیەتی ئەی دڵ"دا کەلە عەرەبی و لە هەڵبەستێکی ئەبولقاسمی شابی‌یەوە وەرگرتووە، تێپی "میم"ی کردووە بە "رەوی‌یە– الروية"ی شیعرەکانی. ڕەنگە گرتنی ئەم چەشنە ڕێبازە هەر ئیلهامی شیعرە عەرەبی‌یەکە بێت، بەلاّم سەرکەوتوویی شاعیر لە وەرگێڕانەکەیدا– پەڵەی لاسایی لەسەر لادەدات.

**شیعری وەرگێڕراو:**

لە مەیدانی شیعری وەرگێڕاودا، ئەم ناوانە لە دیوانی کاکەی فەللاحدا دەبینیی: نازم حیکمەت، ئاراگۆن "تۆفۆی شاعیری چینی، پابلۆ نیرۆدا، ئەبولقاسمی شابی، شیللی، هەندێك شاعیری فارس کەناوی نەهێناون.

رەنگە تەنها فارسی‌یەکانی لە فارسی خۆیەوە وەرگێڕابێت، بۆ ئەوانی تر دیارە هەر لە عەرەبی‌یەوەیە، ئەوەش دیارە کە وەرگێڕی عەرەبی لە زمانی شاعیرە کە خۆیەوە وەرینەگێڕاوە. کەواتە بەچوار پلە بووە بەکوردی. ئەمەش وون بوونی زۆر دیمەنی ئەسڵەکە دەگەیێنێت. شاعیر بۆی هەیە بەم بڕیارە ڕازی نەبێت و داوای بەراوردی هەردوو تێکستەکە بکات کە دەست کەوتنیان زەحمەتەو شارەزای کوردی و ئەم زمانانە پێکەوە بینینەوەش گرانە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت سیمای سەرکەوتن لە شاعیر بەدوور بگرین، هەروەك ریزکردنی ناوی ئەو شاعیرانە تێکڕا دەمانگەیێنێتە ئەنجامی پێوەندیی بیرو ئایدیۆلۆژیی شاعیر بەوانەوە.

بۆ شیللی هەر لە جەمسەری سەر بەهەموو ئەفراندن (ئیبداع)ی گۆرانەوە دەچێتەوە سەری. بۆ ئەوانی تریش هەر تێکەڵ بوونە لەگەڵ ڕێبازی پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێڕی و ریالیزمی سۆشیالیستی‌دا.

**ئەنجامێك:**

زۆر جار کاکەی فەللاح لەگەڵ شاعیرانی قوتابخانەی گۆراندا ناو دەبرێت. ئەو ناو بردنە هەر تەنیا لەبەر پێوەندیی زۆر جەمسەری شیعری ئەو شاعیرانە بەبەرهەمی گۆرانەوە، یا بەسوود لە شیعری گۆران بینین نی‌یە، کە ئەمەش ڕەگەزێکی گەورەیە. بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە گۆران بەتایبەتی لە 15–20 ساڵەی دوایی ژیانیدا (دوورو نزیك) پێوەندیی لەگەڵ زۆربەی شاعیران و نووسەرانی لاوی ئەو سەردەمەدا هەبووو دەستی لە ڕێگە پیشاندان و ڕابەری کردنیاندا هەبوو(69).

پێوەندیی کاکەی فەللاح لەگەڵ گۆراندا هەموو ئەم لایەنانەی تێدایە. لەبەرئەوە بێ‌دوو دڵی و بەشانازی‌یەوە لەڕیزی پێشەوەی شاعیرانی ئەو قوتابخانەیەدا دادەنرێت. بەلاّم کاکەی فەللاح لە زۆربەی ئەو شاعیرانە بەهەندێك دیمەن جیادەکرێتەوە:(69)

*1-لەڕووی ئایدیۆلۆژی‌یەوە تا ئێستا جیاوازی لەنێوان بەرهەمی کاکەی فەللاح و دوا ڕێبازی گۆراندا نی‌یە، باشێوە دەربڕین و تاریك و ڕوونی ئەو دەربڕینە لەم پارچە بۆ ئەو پارچەشدا جیا بێت.*

*2-زۆر لەو شاعیرانە، بەرهەمی تازەیان نەماوەو هەندێکیان لەپێش کۆچی گۆرانەوە هیچیان نەنووسیوەو ڕەنگە ئیتر دواماڵ ئاواییان لە جیهانی ئەفراندن کردبێت، بەلاّم کاکەی فەللاح هێشتا لە کۆڕدایەو لەگەڵ ڕووداوی ئەمڕۆدا دەهەژێ و بەبەرهەمی تازە ئەو هەژاندنە دەردەبڕێت.*

*3-جاران، بەتایبەتی لە ئەدەبیاتی کلاسیکی‌ی عەرەبیدا، شاعیران دەکران بەچەند چینی جیاوازەوە، واتە: بەپێ‌ی پلەی شاعیر یان ڕەخنەگران شوێن و چینی خۆیانیان بۆ تەرخان دەکرا.*

ئەم مەزەندەیە لە فۆڕمی تازەیدا هێشتا لە ڕەخنەی ئەدەبی و مێژووی تازەی ئەدەبیاتدا ماوەو هەر شاعیرە جێگەی خۆی دەدرێتیٚ.

ئەگەر بەهەر مەزەندەیەك بێت دەتوانین جێگەی تایبەتی‌ی کاکەی فەللاح دەست نیشان بکەین. بەلاّم ئەو دەست نیشان کردنە کردارێکی ئاڵۆزەو بۆ ئەمڕۆ دەبیٚ هەموو ڕەگەزەکانی شیعرو تواناو خوڵقێنەریی تێدا ڕەچاو بکرێت و هەموو لایەنەکانی روخسارو ناوەڕۆك بهێنرێنە بەرچاوو پاش ئەو هەڵسەنگاندنە سەختە دوا دەنگ لەسەر پلەی شیعرو ژمارەی لە ڕیزی شاعیراندا بدرێت، کە ئەمەش ئاسان نی‌یەو ئاسانیش نی‌یە کە ڕەخنەگر خۆی لە لایەنگریی ئایدیۆلۆژی خۆی دوور بخاتەوەو هەر دەنگ بۆ روخسار بدات یا بەپێچەوانەوە.

وەك ووترا: ئەم دەنگدانە لە ڕەخنەی ئەدەبی‌ی ئەمڕۆدا زۆر جار ئاڵۆزو بیٚ ئەنجامەو لە ژیانی رۆژانەی ڕەخنەو رۆژنامەگەریماندا لە جیٚ‌ی سوود گەلێك موناقەشەی بیٚبەرو بیزەنتی دێننە پێشەوە.

ئەوەتا هەموو جیهان گۆرانمان بەشاعیرێکی گەورەو یەکەم شاعیری ئەم سەدەیە لیٚ وەردەگرێت، بەلاّم هەیە لای خۆمان، هەر ئەوە نی‌یە کە بەڕابەرو یەکەمی دانەنێن، بەڵکو هەندێك جار دەیبەنە ڕیزی دوواوەو زۆر دواشەوە.

دیارە لێرەشدا مەبەس خۆ دوور خستنەوەو نەوێران نی‌یە بەرامبەر بەدووا دەنگدان و جێگە دەست نیشانکردن بۆ کاکەی فەللاح، کە دیارە هێشتا کاتی ماوەو هەر لەبەرئەوەشە کە دەتوانین بڵێین: کاکەی فەللاح هەربەوە لە شاعیرانی بیست ساڵەی دوایی جیاناکرێتەوە کە وەك ووترا، تا ئێستا بەرهەمی تازەی دەبینین. بەڵکو لەگەڵ بەرهەمە تازەکانیشیدا، تازە کردنەوەو بەرەو ژوور چوون دیارە. لە کاتێکدا بەرهەمی هەندێك لە شاعیرەکانی نەوەی ئەو هەر لەجیٚ‌ی خۆیەتی و خۆ دووبارە کردنەوەیە.

چالاکی‌ی شاعیرانەی کاکەی فەللاح، بەشی زۆری گۆڕەپانی مەبەستەکانی شیعری کوردیی ئەمڕۆ دەگرێتەوە. لەم بارەیەوە دەتوانین بچینەوە ڕیزی کلاسیکی‌یەوەو مەبەسی شیعری ڕیزبکەین و نیشانەی "بەڵیٚ" لای زۆربەی ئەو مەبەسانە دابنێین.

ئەگەر تەماشای بنەستەرە ڕۆژهەلاّتی‌یەکەی کەڵچەری شیعریی کاکەی فەللاح بکەین، ڕەنگە بڕیاری ئەوە بدەین کە بۆ مەبەس ڕیزکردن و لەزۆر مەبەسدا شیعر ووتن، سیمای کۆنی پیٚ دەبەخشیٚ، بەلاّم ئەم بڕیارە پەلەکردن و بڕیار لەسەر ڕەواڵەت دانی تێدایە. چونکە ئێمە باس لە شاعیرێك دەکەین کە ئاشکراو ڕوون لەناو جەرگەی ڕووداوی شۆڕشگێڕی و

تێکۆشانەوە هاتۆتە ناو جیهانی شیعرەوەو هەڵسوکەوتی ئێستاشی لەگەڵ شیعردا هەڵسوکەوتی جووڵاندن‌و ئەندێشەو دەروون هەڵچوونی ئاشکرای تێدا دیارەو شەقڵی کێشەو ئەندێشەی شەخسیی پێوە دیارە، باهەندێکیشیان لە خانەی موناسەبەتیشدا دابنێین. لەم مەبەستەدا دەبێ لای دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێشەر بوەستین‌و بەو پێیە شیعری کاکەی فەللاح دابەش بکەین‌و بیکەین بەسێ جۆر.

1- *هەموو شیعرەکانی (بەهەموو بابەت‌و مەبەستەکانیەوە).*

2- *شیعری وەرگێڕراو.*

3- *شیعری منداڵان.*

وەك بینرا باسی دوو چەشنی یەکەممان کرد، هەرچەند باسەکە، بەتایبەتی باسی جۆری دووەم تێرو تەسەل نەبوو. ئەوەی کە شایانی بەووردی لێکۆڵینەوەیە بەشی سێیەمە. چونکە ئەو بەشە خۆی نرخی تایبەتیی هەیەو تازە خەریکە لە ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەی خۆی دەگرێت. هەر وەك لە باسێکدا کە باسی جموجووڵی ئەدەبی‌و کەلچەریی کاکەی فەللاح بێت، دەبێت لە پاڵ کاکەی فەللاحی شاعیردا لە کاکەی فەللاحی ڕەخنەگرو ڕۆژنامەنووس بکۆڵینەوەو نرخی خۆی بدەینێ‌و لەم دووخانەیەشدا جێگەی خۆی بۆ تەرخانکەین.

(*)هەرچەندە لەم باسەشدا لە شێوەی بیرەوەری گەلێك بەڵگە لە دەربارەی ژیانی کاکەی فەللاحەوە دراوە بەدەستەوە. بەڵام زۆرتر کە باس لە شاعیرێك دەکرێت باسێك لە ژیان‌و لە دایك بوون‌و بەسەرهاتی دەکرێت. هەرچەندە ڕاستتر ئەوەیە کەلە ژیانی شاعیردا زیاتر ئەو لایەنانە دەرخرێن کە لەگەڵ ئیبداع‌و بەرهەمیدا چوون بەیەکداو هەقیان بەسەر یەکەوە هەیە، بەڵام چەند دێڕێکیش هەیە کە بووە بەڕۆتینی باس‌و خۆ لێلادانی ناوێت. بۆ ئەو چەند دێڕەش باشتر وایە کە گوێ لە شاعیر خۆی بگرین کە نووسیوویەیە:

"کاکەی فەللاح، ناوی (حەمە)ی کوڕی (حەمە ئەمین)ی کوڕی (قادر)ەو لە ساڵی 1928ز لە قەزای (شارباژێر)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی هاتۆتە دنیاوەو ڕۆڵەی خێزانێکی دەست کورت‌و شێوە هەژارەو لە ماڵێکدا چاوی کردۆتەوەو ڕاست‌و چەپی خۆی ناسیوە کە کەسیان خوێندەوار نەبوون‌و لە دێیەکدا هاتۆتە دنیاوە کە هەر لەبەرئەوەی لەسەر سنوورەو ناوچەیەکی گەورەو دێهاتێکی زۆری لەسەرە ناویان ناوە قەزا..."

"هەر لە تەمەنی منداڵیەوە حەزی لە شیعرو هۆنینەوەی کردوەو زۆر جار خۆی بۆ ئەو مەبەستە تاقی کردۆتەوە. پاش تەواوکردنی خوێندنی قۆناخی سەرەتایی باوکی ناردویەتی بۆ سلێمانی کە بخوێنێت‌و لە یەکەم بەشی ناوخۆیی وەرگیراوەو هەر لە سەرەتای چوونیەوە تێکەڵ بەچالاکیی یەکێتیی قوتابیانی ئەو سەردەمەو کاروباری سیاسەت بووەو لە ڕێگای سشیعرو شیعر خوێندنەوەشەوە، کەم‌و زۆر، وەك یەکێکی بەرچاو کەوتوو، جم‌و جۆڵ‌و بەشداریی هەبوە.

سەرەتای شیعر دانانی بۆ ساڵەکانی 45-1946 دەگەڕێتەوەو یەکەم شیعری دەربارەی (نەورۆز)ە هیچی لە یادنەماوە.

(بڕوانە: حەمە حەمە ئەمین قادر "کاکەی فەللاح". کاروانی شیعری نوێی کوردی. بەغدا 1978. ل185، 186).

(1) بڕوانە: (سجل الحركة الوطنية ضد معاهدة جبر- بيڤن. بغداد، 1960. ص111-113).

(2) بڕوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە 3، مارتی 1948، ل13-23.

(3) ئەنالیز: ووشەی Analizی گریکی لەزۆربەی زمانەکانی جیهاندا بەمانای "تەحلیل"ی عەرەبی بەکاردێت، لام وایە ئێمەش بۆ ئەو مەبەسەی بەکاربێنین‌و ووشەی "لێکۆڵینەوە"ی ئێستا بەکارهاتووی خۆمان بۆ "تەحقیق" بەکاربێنین باشە. هەرچیش ووشەی داتاشراوی "توێژینەوە"یە، ئەوە لای زۆر لە شارەزایان وایە کە دەبێ لەگەڵ ئەو ووشە دەستکردانەدا کە ناشی دروستی کردوون، لادرێن.

(4) ئەو شاعیرانەی لەو ڕۆژانەدا ناسران، یا شیعریان بۆ ڕاپەڕینەکە ووتووە زۆرن، ناوی هەندێکیان لە تێکستی ئەم باسەدا هاتووە. لێرەدا دەبێ باسی ئەوە بکرێت کە "داری ئازادی"ی بێکەس‌و "ئەم ڕۆژی ساڵی تازە"یەی پیرەمێرد لە ئەنجامی ئەو ڕاپەڕینەوە نووسراون. لەم بارەیەوە دەبێ بنووسرێ کە برای نووسەرم فەرەیدوون عەلی ئەمین لە نامیلکەی "چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر"ی خۆیدا، دوو ڕەخنەی لەو لێکدانەوەیەی هۆنراوەی ناوبراوی پیرەمێرد گرتبوو کەلە کتێبێکدا نووسیبووم.

(بڕوانە: فەرەیدوون عەلی ئەمین. چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر. بەغدا، 1971 ل11-15پ) هەروەها (الدكتور عزالدين مصطفى رسول. الواقعية في الادب الكردي. بيروت، 1966 ص95).

لەناو هەندێك لە نووسەرانی کورددا باوە هەر کەس ڕەخنەی لێگیرا کتوپڕ بەووتارێك وەڵام ئەداتەوەو کۆمەڵێك موناقەشەی درێژ سوودی زۆر پەسەند نییە لام، لەکاتی خۆیدا وەڵامم نەدایەوە. ئێستا لەم شوێنەدا ڕوونکردنەوەیەك خۆی دەسەپێنێت.

بۆ ڕەخنەی یەکەم- لەگەڵ نووسەردام‌و هۆی ئەو چەشنە لێکدانەوەیە ئەوەبوو، کاتێك من ئەو کتێبەم ئامادەکرد، هێشتا دیوانی پیرەمێرد چاپ نەکرابوو، زیاتر پشتم بەو گۆڤارو ڕۆژنامانە بەست کەلە دەرەوەی وولات لەبەر دەستمدا بوون. دەرفەتی بەدوادا گەڕانی بەرهەمی تری پیرەمێرد نەبوو، بەڵام بۆ ڕەخنەی دووەمی ناتوانم بچمە سەر ڕای برای نووسەرم، چونکە هەر لام وایە کە پیرەمێرد ئەو پارچەیەی لە ئەنجامی ڕاپەڕینی کانووندا بۆ نەورۆزی 1948 نووسیووەو گیانی ئەو ڕاپەڕینەش لە شیعرەکاندا دیارە.

**یەکەم:**

تا ئێستا، ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا

قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا

(گەلاوێژ ژمارە 4 ساڵی 9 نیسانی 1948 ل 35 لێرەدا پەنجە بۆ کچە شەهیدی سەرپردی شەهیدانی بەغدا ڕاکێشراوە، ئەوە نەبێت شتێکی تری دیار دەربارەی قوربانی‌دانی کچان لەو سەردەمەدا نابینین. هەروەها گیانی برایی‌و پێکەوە خەبات‌و خوێن تێکەڵ بوونی کوردو عەرەب لە یەکەم ڕاپەڕینی پێکەوەیی‌و هاوبەشدا پیرەمێردی بەرەو ئەو گیانە ئینتەرناسیۆنالی‌یە بردووە کە بڵێت:

**ئەو ڕەنگە سووورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد**

**مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیك ئەبرد**

**(گەلاوێژ، ئەو سەرچاوەیە)**

ڕەنگە لێرەدا مەبەستی بەو ڕەنگە سووره چوار ئەفسەرە کوردە شەهیدەکە بێت. بەڵام "چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێبەست بوو تاکو پار"، نیشانەی سەرکەوتنەو نیشانەی نوشوستی و ماتەمی بێ ئەنجام نییە. بۆ ووشەی "پار"یش کە بەلای نووسەرەوە ناگونجێ لە نەورۆزی 1948دا پیرەمێرد بە 27ی کانوونی دووەمی 1948 بڵێت پار، ڕەنگە واش لێك بدرێتەوە کە پیرەمێرد نەورۆزی بەسەری ساڵ و یەکەم ڕۆژی ساڵ دانابێت، وەك خۆی دەڵێت:

"ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە"

یا:

"مژدە بێ ساڵ گەڕایەوە"

کەواتە هەموو ڕۆژانی پێش نەورۆزی ئەو ساڵە دەکەوێتە ساڵی پێشوو و کۆنەوە.

لە لایەکی ترەوە، بەتەواوی هۆو سەرگوزەشتەی نووسینی ئەو پارچەیە دەزانم و ئەوەش لە بڕیارەکە دڵنیام دەکات. هەرچەندە ئێرە جێگەی گێڕانەوەی ئەو سەرگوزەشتەیە نییە.

هەرچی ئەوەیە کە نووسەر لە کتێبی محەمەد ڕەسوول هاواری شاعیریەوە وەرگرتووە کە گوایە پیرەمێرد ئەو ساڵە نەورۆزی بەنۆجەژنی چوار ئەفسەرەکە داناو ئاهەنگی نەگێڕا، ئەگەر مەبەس نەورۆزی 1947 بێت، ئەوا ئەو نەورۆزە پێش خنکاندنی ئەفسەرەکانە، خۆ ئەگەر مەبەس نەورۆزی 1948 بێت، ئەوە لە سلێمانی دوو ئاهەنگی جیاواز لەلایەن دوو پارتی‌یە سەرەکی‌یەکەی ئەوسا (دیموکراتی و کۆمۆنیست)ەوە گێڕرا، بۆ پیرەمێردیش، ئەگەر سەیری ژمارەکانی ئەوسای ژین بکەین دەبینین کەلە داخی ئەو دوو ئاهەنگە پیرەمێرد ئاهەنگی نەگێڕا.

(5) لە سەرەتای 1948ەوە تا ناوەڕاستی ئەو ساڵە هەندێك سەربەستی‌ی دیموکراتی ئاواڵە کرد. چەند ڕۆژنامەی سیاسی‌ی باش هەبوو، ڕێگەی خۆپیشاندان نەدەگیرا، ڕێگەی دەرچوون بەیەکەم گۆڤاری سیاسی کوردی درا کە "نزار"ی عەلادین سەجادی بوو. بەڵام دوای ئەو ماوەیە زەبرو زەنگ دەستی پێکردو ئەو دەستکەوتانە سەندرانەوە.

(6) ئەو بەشە ناوخۆیە تەنیا ژوورێك بوو لە خانووی کتێبخانەی گشتی‌ی ئەوسادا کە هەر ئەو ساڵە لەلایەن مارف جیاووکی موتەسەریفی سلێمانی‌یەوە لەسەر شەقامی سابوونکەران (تەنیشت ماڵی یەکتابەگ)دا کرایەوە. سەرەتا پێنج قوتابی‌ی تێدا وەرگیرا. یەکێکیان کاکەی فەللاح و یەکێکیان کۆچ کردوو محەمەد ساڵح قەرەداخی (مەفتوونی جافەرانی) بو، کە ماجستێری لە قانووندا وەرگرت. شاعیر یادی ئەو دۆستە، دڵپاکە، ساکارە، خۆ لە پێناوی نیشتماندا بەخت کەرەی لە هۆنراوەیەکی خۆیدا تۆمار کردووە.

(بڕوانە: پارچەی- هاوڕێم مەفتوون).

(7) پاش بەشە ناوخۆکەی قوتابخانەی ناوەندی لە ساڵی 1947-1948دا پۆلێکی "دار المعلمین ریفی" کرایەوە کە هەموو قوتابییەکانی لە بەشی ناوخۆ بوون و لە هەموو لایەکی کوردستانی عێراقەوە هاتبوون. لەبەرئەوەی زۆربەیان کوڕی لادێ و کوڕە هەژار بوون، لەو هەڵچوون و ئاواڵە بوونە دیموکراتی‌یەی ئەوسادا شوێن کارو گورجوگۆڵی‌ی پارتی‌یە سیاسی‌یەکان بوو، هەر لەبەرئەوە لە ساڵی دوواییدا لە سلێمانی لابراو هەموو قوتابیانی برانە دهۆك و بەشە ناوخۆکەی ناوەندی تۆزێ فراوانتر کراو وەك خۆی مایەوە.

(8) لەو ساڵانەدا زۆر هانی خوێندنەوە دەدرا، لە سلێمانی لە پاڵ کتێبخانەی گشتیدا، لەسەر شەقامی مەولەویی ئێستا دوو کتێبخانە هەبوو "ڕووناکی" کە سەر بەلقی کۆمەڵەی "ژ.ك" بوو، "بیری نوێ"، کە پارتی ئازادبوونی نیشتمانی (التحرر الوطني)ی سەر بەکۆمۆنیست دانابوو، زۆر چەشنە کتێبیان هەبوو، بەکرێیەکی شەوانەی کەم وەرمان دەگرت و دەمانبردە ماڵەوە.

هەموو قوتابی‌ی ئەو سەردەمەی سلێمانی یادگاری یەکەم خوێندنەوەی ئەدەبیاتی پێشکەوتنخوازمان لەو کتێبخانانەوە دەست پێدەکات، وەك لە بیرم بێ، کاکەی فەللاح یەکێك بوو لە سەرپەرشتکەرانی کتێبخانەی "بیری نوێ".

(9) ئەو ڕاپەڕینە کۆمەڵێك خەتیبی دەنگ دلێری پێگەیاند. لەوانە ئەم دوو شاعیرە بوون کە هێشتا دەستیان نەدابووە شیعر نووسین، بەڵکو دوو سێ ساڵ پاش ڕاپەڕینەکە دەستیان پێکرد.

(10) حاجی باقی‌ی بەنگینە، شاعیرێکی میللی کورد بوو، لە قوتابیانی زانستی بوو لە ساڵەکانی سی‌یەوە شیعری لە ڕۆژنامەکاندا هەیە، بەتایبەتی لە "ژیان"و "ژین"دا، بەداخەوە تا ئێستا شیعرەکانی نەکۆکراونەتەوەو نەچاپ کراون.

(11) محەمەدی مەلا حسینی حافز- تا ئێستا لە سلێمانی بەرگدرووە، لە خۆپیشاندان و کۆبوونەوەکانی ڕۆژانی ڕاپەڕینی کانووندا شیعری شۆڕشگێڕیی دەخوێندەوە، ئێستاش هەندێ دێڕی لە گوێمدا دەزرنگێتەوە وەك:

**خائینان ئەمڕۆ بەجاڕێ شەرمەزارو مل کەچن**
**قوڕ بەسەر گەورەو بچووکیان تازە بۆ کوێ دەڕئەچن**

یا سەرەتای پارچەیەکی کەلە یەکێك لەو کۆبوونەوانەدا خوێندی‌یەوە کەلە دەشتی گاوران، بەبۆنەی هەڵبژاردنی پەرلەمانەوە خوێندی‌یەوە وای دەست پێکرد:

**خۆزگە ئەمزانی لەلایان ئینتیخاب مانای چی‌یە؟**
**ڕەنگە وابزانن سێبازەو دوور بەدوور بۆی هەڵئەچن**

**شیعری ئەمیش تا ئێستا هیچی چاپ نەکراوە.**

(12) کاکەی فەللاح خۆی لەو کتێبەدا کەلە کاتی ئامادەکردنی ئەم باسەدا چاپ کرا، ناو نانەکەی خۆی بەجۆرێکی تر دەگێڕێتەوە. (بڕوانە: حەمە حەمە ئەمین قادر "کاکەی فەللاح" کاروانی شیعری نوێی کوردی. بەغدا، 1978. ل191،192).

بەڵام من دڵنیا ترم لە ڕاستی‌ی ئەوەی نووسیوومەو وا دەزانم شاعیر خۆی باشی لەبیر نەما بێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە نووسیووی‌یە کە گوایە ئەو پارچەیەی خۆی کە ناوی "کاکەی فەللاح"ی تێدایە لە کۆبوونەوەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی ساڵی 1947دا لە ساحەی قوتابخانەی ناوەندیی ئەوساو (غازی و شێخ مەحموودی لەمەودوا)دا خوێندراوەتەوە، لە کاتێکدا کە ئەو کۆبوونەوەیەی ئەو دەڵێ لە ساڵی 1948دا بووو پاش هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی پێشوو بوو، لەو هەڵبژاردنەدا پارتی ئازادبوون کۆچ کردوو مەحموود فەهمی‌ی فەقێ محەمەدی هەمەوەندو پارێزەر شەریف شێخیان پاڵاوتبوو.

کاکەی فەللاح ئەو پارچەیەی باسی دەکات هەر لەوێدا خوێندەوە هەرچی هەڵبژاردنی ساڵی "1947"ە، ئەوە لە سلێمانی دەست نیشانکراوانی حکوومەت بەبێ هەڵبژاردن بە "تزکیە" دەرچوون و هیچ کۆبوونەوەش نەکرا. ئەوساڵە عەلی کەمال لەلایەن حکوومەتەوە دەست نیشان نەکرابوو. هاتە سلێمانی و بەبەیاننامەیەك خۆی پاڵاوت. لەوە دەچوو کە هەندێك لە دەستە نیشتمانپەروەرەکانی لەگەڵ بێت و کارەساتێکی خوێناوی بقەومێ، جالەبەر ئەوەو هەندێك تکا بێت خۆی کشاندەوە. بەیاننامەی خۆپاڵاوتن و خۆ کشاندنەوەی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە (گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە 3 ساڵی 8 مارتی 1947 ل29- 30 تەنیا ئەوە بوو هەموو شاری سلێمانی لەرۆژی هەڵبژاردندا مانی گرت. وەك ئەمڕۆ لەبیرمە، گۆڤاری گەلاوێژ بەپۆستە بۆ بەشداران دەهات. هەر لەو ساحەیەی قوتابخانەی ناوەندیدا کۆمەڵێك قوتابی بوو لەدەوری کاك کەمال میرزا کەریم وەستابووین، کە یەکێك بوو لە ڕابەرانی بزووتنەوەی قوتابیان و پاش ڕاپەڕینەکە بوو بەسەرۆکی یەکەم یەکێتیی ئاشکرای قوتابیان لە سلێمانی. ئەو قسەی بۆ دەکردین کە کاکەی فەللاح ژمارەی تازەی گەلاوێژی بەکراوەیی بۆ هێناو ووتی شتێکی سەیری تێدا نووسراوە، کە خوێندییەوە ئەمیش ووتی: دیارە چونکە بەپارەی ئەو دەردەچێت. دوایی تێگەیشتن کەلە گەلاوێژدا نوسرابوو کە ئەو مانگرتنە لەبەر کشانەوەی عەلی کەماڵە، لە کاتێکدا بەلای ئەمانەوە کەسەر بەچەپ بوون هەر ناڕەزایی بوو بەرامبەر بەساختەیی هەڵبژاردن. بڕوانە (گەلاوێژ. ژمارە 3 ساڵی 8. مارتی 1947، ل72).

(13) ئەم هۆنراوەیەی کاکەی فەللاح بڵاونەکراوەتەوەو خۆیی لەبیری نەماوە.

هەر لەڕیزی ئەو کۆمەڵە یادداشتە تۆمار کراوانەی ئەم باسەو پەراوێزەکانی، لە سوود بەدەر نییە کە بنووسرێت: کاکەی فەللاح ئەم پارچەیەی لە یەکێك لەو دوو کۆبوونەوەیەدا خوێندەوە کەلە بەردەمی گردی سەیواندا کران و بەشدارەکانیان بەچەپکە گوڵەوە چونە سەر گۆڕی شەهیدان. لە یەکێك لەو دوو کۆبونەوەیەدا نوێنەرانی دار المعلمینی ریفیی محاویلیش بەکوردو عەرەبەوە هاتبوون. چەپکە گوڵیان بردە سەر گۆڕی مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی و قالە چاوشینی شەهیدی ڕاپەڕینی کانوون (عەبدولقادر عەبدوڵڵا) و گۆڕی نووسەری پێشکەوتنخواز عبدولواحید نووری. قوتابییەکیان کە ناوی عەلی مەگتووف (مگطوف) بوو، دوو پارچە شیعری بابەتی کۆبوونەوەی گشتی بەعەرەبی خوێندەوە. لە شیعرەکانی دێڕو نیوێکم لەبیرماوە:

العنصرية أضحت لاتطاوعهم
بوحدة الاكراد للعرب تنفصم
يا "جئت أزجي بسيوان لعبدالواحد أشجاني".

هوتاف کێشی دیاری ئەو نوێنەرانەش حەسیب قەرەداخیی شاعیر بوو کە ئەوسا لە محاویل قوتابی بوو.

(14) تەنیا من نەسوتێم تۆ نەسووتیی لە هۆنراوەیەکی نازم حیکمەتەوە وەرگیراوە، ئەویتری کاکەی فەللاح خۆی نووسیوویە، ئەم هۆنراوەیەش بڵاوکراوەتەوەو نازانم لای شاعیر خۆی مابێت یانا.

(15) وەك هۆنراوەکەی هەردی:

کوڕانی ڕۆژی مەیدانی شەڕو ئاشووب و ئاژاوە
براکانم کرێکاری هەموو ئەم لانە ڕووخاوە

(16) ئەم پارچەیەی بەناوی "م. شارباژێڕی"یەوە بڵاوکردۆتەوە بڕوانە: "گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە 4 ساڵی 9، نیسانی 1948 لە36،37.

(17) مەبەست ئەو کەسانەن کە ڕۆڵی ڕابەریان لە ڕووداوی ڕاپەڕینەکەدا بووو هێشتا ماوون. نوسەری ئەم باسە ئەوسا قوتابیی پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو بەشداری خۆپیشاندانە-کانی ئەو ڕاپەڕینە بووو توانای تۆمارکردنی ڕووداوەکانی هەیە، بەڵام ڕەگ و لایەن و سووچی تر بەڕابەرەکان دەکرێت.

(18) شێخ کەریمی بەرزنجەیی، زۆر دۆستی هەردی بوو، دوایی بوو بەخەزووری. , لەپاڵ حەز لە ئەدەبیاتدا، ماوەیەکی زۆر لە کۆڕی تێکۆشانی سیاسیشدا جێی خۆی هەبوو. پاش شۆڕشی "14"ی تەمووز کۆچی دوایی کرد.

(19) تۆفیق محەمەد، تا ئێستا لە سلێمانی بەرگدرووە، بەشداریی خەباتی شۆڕشگێڕی و پاشان ئاشتیخوازی لەگەڵ کۆمەڵێك تێکۆشەرو ڕۆشن بیردا تا ئێستا کردوویەتی بەدۆست. سەرەتا ئەوەبوو باسکرا بەڵام لەمەودوا دۆستی نزیکی گۆرانی نەمر بوو، کاك تۆفیق ئینسانێکی دڵپاك و دڵسۆزو قسەخۆشە سۆزێکی تایبەتی دەدات بەقسەگێڕانەوە، هەر ئەمە وایکردبوو گۆران هەمیشە دەیووت: ئای چەند بەهرەی وا گەورەمان لە کیس چووە. ئەگەر تۆفیق خوێندەوار بووایە، دەبوو بەگەورەترین چیرۆك نووسی کورد.

سەرەتا لە دوکانە هاوبەشەکەی ئەواندا و دوایی لە دوکانە جیاکەی کاك تۆفیقدا مەمەند ئاغای فاذیی شاعیرمان ناسی و پێوەندیی بەتینی گۆران و فانی و خوانی شیعری عیشقی زادەی ئەو یانەیەو کەرەسەی هەندێك یادداشتی ئەدەبیی ترە، کەلە جێی خۆیدا دەبێ ڕاگەینرێت.

(20) عورفی (عارف مەحموودی بەرزنجەیییە کە بەعارف قاپ ڕەش ناسراوە) ساڵی (..) لە دایك بووە، ساڵی (...) کۆچی دوایی کرد، زەوقێکی ئەدەبیی بەرزو شیعری کلاسیکیی جوانی هەبوو.

چاوەڕێی ئەوەین کە برای مامۆستاو نووسەرمان عومەر عارف (کە کوڕە گەورەی شاعیرە) دیوان و ژیانی ئەدەبیی بەچاپ بگەیێنێت.

(21) بەداخەوە ئەو کۆمەڵە چیرۆکەم پاش ڕاپەڕینی تشرین وونبوو. دەستنووسێکی لە سلێمانی برادەرێکم سووتاندبووی, دووەمیش: لە بەغدا درا بە ئاشتیخوازان و بڕیاری چاپییاندا, بەڵام ئەو هێرشی زەبرو زەنگەی پاش ڕاپەرینەکە هات و هەموومانی گرتەوە تا 1954 هێواش نەبۆوە, ئەوساش کۆمەڵە چیرۆکەکە نەمابوو, لەبەرئەوەی بڕیاریشم بەپێی ئامۆژگاریی رابەرو مامۆستایەکی ژیانم ئەوەبوو کە ئەدەبیات بە کوردی بنوسم و عەرەبی زانین بۆ کورد بە برای عەرەب ناسین بەکار بێنم ئیتر هەوڵی نووسینەوەیانم نەدا. ئەگەر چاپ بکرانایە زۆر نیشانەیان بۆ ڕێڕەوی ئەدەبیی خۆم و چیرۆکی کوردی و سەرەتای بەرهەم دەست نیشان دەکرد.

(22) لە قەراخ شار گیرفانی گەڕابوون, هێنابوویانەوە بۆ پۆلیسخانەی ناوشار. سەرەکی گڤەگڤی زۆری کردبوو. ئەوسا چاوەشێکی پۆلیسی بانگ کردبوو, شیعرەکانی بۆ بکات بە عەرەبی.

کاکەی فەللاح دەیگێرایەوە دەیووت: کابرای چاوەش هەر ڕەش و سپیی خوێندەواریی دەزانی, لەبەر ئەوە لەجێی کردن بە عەرەبی هاواری

دەكرد: بێگ.. هذا عشك, هذا عشك, ماكدر... واتە: بەگم ئەمە دلدارییە, ئەمە دڵدارییە, ناتوانم.

(23) پاش ئەو خۆشاردنەوەیە, جارێكی تر گیرا, لە كاتی ڕەوانە كردندا(یابۆ سلێمانی هێنانەوەدا) لە گەراج خۆی لەدەست پولیس ڕاپسكان و بەكەلەبچەوە ڕای كرد, ڕەنگە هەرقسەی خۆشی تێكۆشەرانی ئەو كاتەبێت كە لەناو خەڵكدا وابلاّوبوو, كە بۆ سبەینێ كەلەپچەكەیان لە حەوشەی سەرادا بۆ حكومەت فڕێدا بۆوە.

(24) لەبەر ئەوەی ئەو یادگارە زیاتر پێوەندیی بە خۆمەوە هەیەو هەر هێندەی ووتم كاكەی فەللاحی پێوەیە, لەبەرئەوە شوێنی تایبەتیی خۆی بۆ باس كردنی دێت.

(25) بڕوانە: حەمە حەمە ئەمین"كاكەی فەللاح". كاروانی شیعری نوێی كوردی. ب1. بەغدا,1978. ل195.

(26) هەرچەندە كاكەی فەللاح لە ماوەی ئەو خۆشاردنەوە درێژەدا بەكاری سیاسی و ڕێكو پێكخستنەوە خەریك بووە, بەڵام یەكجاری لە كۆڕی بەرهەمی ئەدەبی دوور نەكەوتبۆوە, چەند جار لەڕۆژنامەی نهێنیی ئازاریدا شیعری بێناومان دەخوێندەوە و زوو شاعیرمان دەناسییەوە كە زۆرتر یا.. "دلزار" بوو یا كاكەی فەللاح هەروەها لەو ماوەیەدا پارچەیەكی بە ناوی ڕووناك محەمەدەوە ناردبوو بۆ ڕۆژنامەی ئاشكرای ژین.

ڕووناك ناوی كچە گەورەی شاعیرەو ئەوسا تەمەنی 3ساڵ ئەبوو. سەیر ئەوەیە شاعیرێك یەكسەر شیعری دڵداریی بۆ ڕووناكی شاعیر نووسی و نووسەرێك بە ناوی ڕەخنەوە لە ناو ژنە شاعیری كورددا ناوی تۆمار كرد.

(27) دەكۆمێنت: بەڵگە, وەسیقە(وثیقة). دەكۆمێنتی(وثائقی).

بۆنموونە, ئەو دیرە ساكارەی باسی بەرەی نیشتمانیی تێدا كرا(بڕوانە: پەراوێزی ژمارە13), بەڵگەی بانگەواز و هاواری بەرەی نیشتمانییەكە لە دەكۆمێنت و بەرهەمی سیاسیی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی ئەوسادا وێنەی دەبینین.

(28) زوربەیان بلاّو نەكراونەتەوە, دەتوانرێت لەزاری ئەو نەوەیەی ئەوساوە كە هێشتا ماون و شیعریان لە بیرە كۆ بكرینەوە.

(29) مەبەس بزووتنەوەی ئەو نەوە شاعیرەیە كە نەوەی ڕابەر (جیل الرواد)یان پێ دەڵێن و دیارتریان: بەدر سەییاب و بەیاتی و نازك مەلائیكەو بلّند حەیدەری بوون، هەرچەندە ڕەخنەگرە عەرەبەكان هەر ئەم چوار ناوە دەكەن بەنموونەی ئەو نەوەیە، بەلاّم وابزانم (حسین مەردان)یش دەبێ بچێتە ریزی ئەو چوارەو لەو جێگەیەدا ناوی ببرێت.

(30) لە مەهرەجانی شیعری كوردیی 1972دا لە كەركوك، شیعرەكانی شێركۆ بێكەس و عەبدوڵلا پەشێو جێی پەسەندییەكی تەواوی خەڵك بوون.

(31) لەبەر ئەوەی زوربەی بەرهەمەكانی پلەی یەكەمی وون بوون, توانای لێكۆڵینەوەی فراوانیان نییە. لە لایەكی تریشەوە زۆری ئەو لێكۆڵینەوەیە دەبێت دەربارەی ناوەڕۆكی شیعری ئەو پلەیە بێت و بە ڕووداوی سیاسیی ڕۆژانەی ئەو دەمەوە ببەسترێت.

(32) زۆرجار باسی ئەو شاعیر یا ئەم شاعیر و پێوەندییان بە قوتابخانەی گۆرانەوە دەكرێت و بە زۆر لەنرخی گۆران كەمدەكرێتەوە, بەلاّم ئەگەر لەم باری سەرنجەوە تەماشای شیعری كوردی بكەین, بڕیاری ئەوە دەدەین كە هێشتا شیعری كوردی لە ژێر تەئسیری قوتابخانەی گۆراندایە.

(33) لێرەدا دەووترێ كێشی كۆن و ناووتری عەرووز, چونكە كێشی عەرووز بە پێی پراكتیكە تەواوە عەرەبییەكەی لە كوردیدا نیە. زوربەی ئەوانەش كە لەسەر كێشی عەرووزیان نووسیوە دانیان بەمەدا ناوە, لەم بارەیەوە خەریكی ئامادەكردنی باسێكم بەم ناو نیشانەوە. هەر وەك قوتابیی هێژاو بە توانام فریاد فازیل زەنگەنە. كە چەند ساڵ لە بەشی كوردیی زانستگای سلێمانی لێهاتووانە دەرسی ووتەوە و ئێستا قوتابیی دوكتۆرای زانستگای بەرلینە.

كۆششێكی باشی لەم بارەیەوە كردووە و هیوادارم ڕەشنووسەكانی ببنە كتێبێكی باش و زوو بیبینین.

(34) زمانی شیعری شێخ نوری و گۆران لەپلەی ڕۆمانتكییدا ئەو زمانە تێكەڵەبوون كە گۆران(كوردیی عوسمانی)ی پێدەڵێت(بڕوانە: گۆران. بەهەشت و یادگار1951ل3). پیرەمێرد لە شیعرەكانی خۆیدا(لەوەرگێڕاندا نا) بەلای كوردیی پەتیدا هات. گۆران لەپلەی ریالیستیی خۆیدا تەواو كوردیی پەتیی چەسپاند.

(35) (تێبینی: لەبارەی گۆڕینی زمانی شیعری كوردی لە ساڵی1971دا موحازەرەیەكم لە مەڵبەندی یەكێتیی نووسەرانی كورد– لەبەغدا– خوێندەوە هیوام وایە دەرفەتی چاپی دەست كەویت).

(35) دوان دان: گۆران لە موحازەرەی ڕەخنەی ئەدەبیی كۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدایدا بە مانای(ریتورتیكا: خطابة) بەكاری هێناوە.

(36) دەستنوسی دیوانی شاعیر.

(37) دەستنوس دیوانی مەحوی بەغدا,1977. ص219.

(38) دەستنوس دیوانی مەحوی بەغدا,1977. ص219.

(39) دەستنوس دیوانی مەحوی بەغدا,1977. ص219.

(40) بنەستەر: بناغە: بنچینە: هیم.

(41) دەستنووس

(42) دەستنووس. (پارچەی"ئەی كامەرانی" كە ساڵی1957 ووتراوە.)

(43) =

(44) = چوارینی"گەلاّرێزان" و "ژیان و مردن".

(45) =. پارچەی"هیوا" سەرەتای ساڵی1958.

(46) دەستنووس.

(47) ئەو قسانە هەر وورتەی دەمی بوون و نەنووسراون, لەبەر ئەوە بەدرۆ خستنەوەی هەر بەدەم بوو.

(48) بڕوانە: هەناسەیەك(1960), بادەی خەم(1962)(بۆفریشتەیەك).

(49) بڕوانە: كۆتایی پارچەی بۆ فریشتەیەك.

(50) بڕوانە: گۆران.

(51) دەستنووس.

(52) دەستنووس.

(53) دەستنووس.

(54) =

(55) تێبینی: گۆران لەگەڵ شیعری عیشقی و ئەبوتورابی جەلیدا پێوەندییەکی گەورەی هەبوو.

(56) دەستنووس.

(57) =.

(58) =.

(59) لەپاڵ مێژووی لە دایك بوون و مردنی زۆر پیاوی ناودار و ئەمەکداردا, بەڵگەی گەلێك ڕووداوو کارەساتی سەر بەوولات لەو کێڵانەوە دەچێتە سەر لاپەڕەی نووسینەوەی مێژوو.

(60) ئەحمەد هەردی. رازی تەنیایی. بەغدا,1957, ل

(61)دیوانی بێخود. بەغدا,1970, ل142–155.

(62) عەلی تەرەماخی. دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی. لێکۆڵینەوە

بەڵام سەیر ئەوەیە کە"دکتۆر کامل بەصیر" خۆی لەو ڕایە پەشیمان بۆتەوەو هێرش دەباتە سەر ئەوانەی شیعر و شاعیری درۆیان دروست کردووە.(بڕوانە: د. کامل حسن عزیز البصیر. محاضرة في الحلقة الدراسية التي نظمها الاتحاد العام لنساء العراق. نیسان,1978, ص57."طبع رونيو".

بۆ تێگەیشتن لەهۆی ڕاستی ئەم دەست نیشانکردنەی سەرەوەدا بڕوانە دەست نیشانکردنێکی تری ڕاستی دوکتۆر مارف خەزنەدار لەم بارەیەوە.

"الدكتۆر معروف خزنەدار. مخطوطات فريدة و مطبوعات نادرة. ج1. بغداد,1978. ص52.

(65) دەستنووس.

(66) بڕوانە: حەمە حەمە ئەمین قادر"کاکەی فەللاح" کاروانی شیعری















# کورتە هەڵسەنگاندنێکی ژیان و بەرهەمی شیعریی کاکەی فەللاح

**بە پێنوسی خۆی**

کاکەی فەللاح،[1] ناوی (حەمە)ی کوڕی (حەمە ئەمین)ی کوڕی (قادر)ەو لە ساڵی 1928ز لە قەزای چوارتا (شارباژێر)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی هاتۆتە دنیاوەو رۆڵەی خێزانێکی دەست کورت و شێوە هەژارەو لە ماڵێکدا چاوی کردۆتەوەو راست و چەپی خۆی ناسیوە کە کەسیان خوێندەوار نەبوون و لە دێیەکدا هاتۆتە دنیاوە کە هەر لەبەرئەوەی لەسەر سنورەو ناوچەیەکی گەورەو دێهاتێکی زۆری لەسەرە ناویان ناوە قەزا...

کەلە خەم ڕەخسیوە باوکی بەدەستوری ئەو سەردەمە ویستویەتی گوڵستان و بۆستانی سەعدی لە حوجرەدا فێر ببێت، بەڵام ئەم چاوی لە هاوڕێکانی کردوەو رێگای قوتابخانەی گرتۆتە بەرو، بەتایبەتی لەو سەردەمی خوێندنی سەرەتاییەدا زۆر حەزی لە قسەو ئامۆژگاریەکانی (ع. و نوری) کردوە کە بۆ ماوەی سێ ساڵێك (39، 40، 41) بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان بوە لە چوارتا. لە پاڵ خوێندنەکەشیدا زۆر یارمەتی باوکی داوە لەکارو باری دوکان و وردە فرمانی تردا.

هەر لە تەمەنی منداڵییەوە حەزی لە شیعرو هۆنینەوەی کردوەو زۆر جار خۆی بۆ ئەو مەبەستە تاقی کردۆتەوە.. پاش تەواو کردنی خوێندنی قۆناخی سەرەتایی باوکی ناردویەتی بۆ سلێمانی کە بخوێنێت و لە یەکەم بەشی ناوخۆیی وەرگیراوەو هەر لە سەرەتای چوونیەوە تێکەڵ بەچالاکی یەکێتی قوتابیانی ئەو سەردەمەو کاروباری سیاسەت بوەو لە ڕێگای شیعرو شیعر خوێندنەوەشەوە، کەم و زۆر، وەك یەکێکی بەرچاو کەوتو، جەم و جۆڵ و بەشداری هەبوە..

سەرەتای شیعر دانانی بۆ ساڵەکانی 45- 946 دەگەڕێتەوەو یەکەم شیعری دەربارەی (نەورۆز)ە هیچی لەیاد نەماوە.. ئەم دو سێ پارچە شیعرەی خوارەوە نمونەی بەرهەمی ئەو سەردەمەیەتی:

**ڕێگای بەختیاری**

**ئەوەی ئەیەوێ ببێ بەختیار**
**بیرو باوەڕم بکا ئیختیار**
**پێش هەمو شتێ بەرەو نیشانێ**
**ڕێ بکوتێ خۆیشی با لەسەر دانێ**
**چاوی نەترسێ بچێ بێ پشو**
**گیانی نەبەزین بکا توێشو**
**ئەبێ بزانێ لەسەر ئەو ڕێیە**
**کە نەبێ هەزار چوتورمی لێیە**
**دوژمنی خاوەن چەکی هەمە ڕەنگ**
**لەسەر چونی ئەو لەو ڕێیە بون بەنگ**
**ئەویش لە سایەی ئەو هێزو تینەی**
**میللەت داویتیە لەو وەرسی ژینەی**
**لەگەڵیان بکا بەربەرەکانی**




**تاکو بڵێسەی گری تەکانی**
**ڕۆشن کەرەوەی بەر دەرکی شادی**
**دەریخا بۆتە شبری ئازادی**

ئەم شیعرە کەلە هۆنراوەوە نزیکە، دەست نیشانی ئەوە دەکات کە شاعیر خۆی بەهەڵگری بیرو باوەڕێك داناوەو بەلای چەپدا رۆیشتوەو پێش کەوتوە. وەك ئاشکرایە، ناوچەی شارباژێر، کە شوێنەزایەتی ناوچەیەکی لادێیەو جوتیار نشینەو چەوساندنەوەی چینایەتی زۆر بەزەقی پێوە دیار بوەو هەمیشە شێخ و ئاغاو بەگە زۆردارەکان چەوسێنەری چینە رەش و روت و خوێن مژراوەکان بون و سێبەری خوای ئاسمان بون لەسەر زەوی و وەك سپڵی لاورگ لەسەر حسابی ئەو هەژارە کەساس و زەبونانە تەواو بەخۆشی ژیاون.. چیرۆك و بەسەرهاتی ژیانی و گوزەرانی ئەو چەوساوانەش، وەك هەوێنێك، لە سەرەتاوە کەرەسەی بایەخی شیعرو هۆنینەوەی ئەم شاعیرەمان بوەو ئەوەتە لە پارچە شیعری (وڵی جێماو)ی ئەو سەردەمەیدا رو دەکاتە جوتیارو دەڵێت:

**ئەی ئەو کەسەی هەمیشە**
**پیشەت کۆشش و ئیشە**
**بەسەرگەرمی، بێوچان**
**لەسەر ڕێگای هەوڵدان**
**تاکو دواهەناسەن ژین**
**بەخت ئەکەی تەوژم و تین**
**بەرەنجی شانی بازو**
**بەگاسنی بێ پشو**

جەرگی زەوی دەرئەدەی
تۆوی بەسەردا ئەکەی
بەئارەق و ئەشکی چاو
پەروەردەی ئەکەی تێراو
جا بەداسی بزوتن
ئەکەویە درەو کردن
لەگەڵیا ئەکەویە خۆ
پێی ئەبری بەرگی مەڵۆ
لەویٚ لەسەر پشتی ورد
گێرەی ئەکەی دەست و برد
بەشەنی بیٚ وچانی
لێك ئەکەی پۆش و دانی
دوای ئەو ئەمجا کێشەوە
خۆی ئەکوتیٚ بۆ پێشەوە
بەڵام جوتیاری داماو
سەرەرۆی گوڵی جێماو
بۆ ئاغایە شەن و کەو
کردەی تۆیەو بردەی ئەو

هەر لەو سەردەمەداو ئەم چەشنە جم و جۆڵ و بیرو باوەڕە پێشکەوتنخوازو باس و خواستی چەوساندنەوەو کاروباری خەباتی چینایەتیە بۆ ماوەی چەند شەوو رۆژێك دەبێتە میوانی بەزۆر بانگ کراوی بەندیخانە، کە ئوتێل بەلاشمان پیٚ دەگوت و لە ژورێکی دەرگا بچکۆلەی بیٚ پەنجەرەدا گیری دەدەن و ئەمیش بەدزییەوە لەسەر پشتی پارچە مقەببایەکی شڕ ئەم (ئەی شەو)ە دەنوسێت و دەڵێت:

دریٚخیم لیٚ مەکە ئەی شەو، بەهێزی جوتە باڵی ڕەش
زەمینی ژینەکەم یەکسەر بخە ژێر سێبەری باوەش
بەسەرما شێوە ڕەشماڵی هەڵیبە جوستەکەم بگریٚ
هاتە ئەتوانیٚ پرشنگی ژیانی شادی من بگریٚ
مەهێڵە روبەڕوی من بیٚ، بەرەوروی زۆر بەدەربەستی
بچۆ تاکو لە تواناتا هەیە زو بیکە بەربەستی
برۆ هەرچی ئەکەی دەربارەمی کەسا بەچالاکی
پەلامارێکی شێتانە بەرە سەر تیشکی روناکی
بەقامچی گازەرای پشتی سەراسەر تویٚخی داماڵی
بەرەو دوا بیٚ ئەوەی سڵ کەی نەوەك روناکی راماڵی
لە ئامۆژگاری ئەستێرەو رەشی ئەو هەورە تارایە
کە تان و پۆی چنینی چۆتە یەك چیکەت لە بارایە؟!
بەگیانێکی نەبەز، پردەم، ئەڵێم تۆی ملکەچی فەوتان
نەمانە پاشەڕۆژی هێزی کاروانانی ریٚ چەوتان

مەسەلەی لەقەبی (کاکەی فەللاح)یش تا ئێستا زۆر کەس نازانێت لە چیەوە هاتوەو ئایا خۆی ناوی وایە، یان خۆی بۆ خۆی هەڵبژاردوە، یان خەڵکی بەسەریدا بڕیوە؟ ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەم لەقەبە هەر تەواو ناوە ڕاستیەکەی شاعیری قوت داوەو جوڵەی لیٚبڕیوە... سەرەتای ئەم لەقەبە بۆ ساڵی 1947ز دەگەڕێتەوە، بۆ سەردەمی هەڵبژاردنی نوێنەرانی پارلەمان کە پارتی کۆمۆنیست و حیزبی ئازادکردنی نیشتمانی لە سلێمانی کۆبونەوەیەکی تەواو گەورەیان بۆ سازکردو لە ساحەی قوتابخانەی سانەوی (غازی)، قوتابخانەی شێخ مەحمودی سەرەتایی ئێستا، ئەو کۆڕە بەستراو، ئەمیش بەو بۆنەیەوە پارچە قەسیدەیەکی دورو درێژی خوێندەوە کە خۆیشی هەر ئەوەندەی خوارەوەی لە بیر ماوەو دەڵێت:

کرێکارو قوتابیو چینەکانی روت و بیٚ نانت
سەپان و کاکی فەللاحی بەرەی تاڵان کراوانت
لەگەڵ کیژو هەتیوانی کزی بیٚ سوچ و تاوانت
ئەڵیٚ دەی ڕاپەڕەو گویٚ بگرە کففەی خوێنی لاوانت
بەدەنگی بەرز ئەڵیٚ، نێزیکە جەژنی بەش خوراوانت
برا ئەو گیانە خاوێنەی کەوا قوربانی ڕێی تۆیە
ئەڵیٚ: مەجلیسی وا دانیٚ کە بۆ سەربەرزی تۆ هۆیە
بڵیٚ: ئۆباڵی چەن ملیۆن هەژارانت لە ئەستۆیە
ملی ڕێگەی چەوت نەگری دەسم دامێنت ئەمڕۆیە
دەسا دەی ڕاپەرەو گویٚ بگرە کففەی خوێنی لاوانت
بەدەنگی بەرز ئەڵیٚ: نێزیکە جەژنی بەشخوراوانت
لەئینسانێکی بیٚ فەردا نەچی دەنگت بدۆڕێنی
دەخیلت بم نەکەی لاشەی شەهیدانت بتۆرێنی
بەدەربەستی نەیەی تادوا دڵۆپی خوێن بچۆڕێنی
لە تۆدیٚ ڕەورەوەی مێژو بەرەو پێشیٚ بسورێنی
دەسا تۆش ڕاپەرەو گویٚ بگرە کففەی خوێنی لاوانت
بەدەنگی بەرز ئەڵیٚ: نیزیکە جەژنی بەشخوراوانت

جالەبەر ئەوەی کە وشەی (کاکەی فەللاح) لەم شیعرەدا هاتوەو شاعیریش لە پێشکەشکردندا بەناوی فەللاحە رەش و روش و چەوساوەکانی ناوچەی شارباژێرەوە پێشکەکیەکی بەپەخشان خوێندەوە، لەقەبی (کاکەی فەللاح)ی بەسەردا دابڕاو بو بەلەقەبی شیعر بۆی لەو سەردەمەدا کە شەپۆل و لافاوی بزوتنەوەی نیشتمانی بەرەو ڕاپەرینەکەی کانونی 1948، رۆژبەرۆژ، لە بەرزبونەوەو تەوژما بو... دوای بگرەو بەردەو سزاو ئەشکەنجەیەکی زۆرو سەبارەت بەجم و جوڵی شیعری سیاسی لە کۆبونەوەو خۆپیشاندانەکاندا (کاکەی فەللاح) میوانێکی هەمیشە نوێن بەکۆڵی خانەخویٚ نەویستی هەر رۆژە نا رۆژێکی بەندیخانەکانی ئەو رۆژگارە رەشە بو[2].

تا وای لیٚهات یاساوڵ لەسەر کورسی قوتابخانەو خوێندن پەلی گرت و بەپێچەوانەی یاساو وەسیقەی قوتابخانەو شەهادەتی موختار، بەزۆری زۆردارەکی لە پۆلی سێی ناوەندی ڕاپێچی سەربازی کراو مۆری (متخلف)یان بەناوچاوانی موعامەلە دەسکردەکەیەوە ناو لە ترسی جەماوەری گەلی سلێمانی، کە خۆپیشاندانێکی ناڕەزایی گەورەی 30 هەزار کەسیان بۆ کردو هەڵیان کوتایە سەر بەندیخانە، لە نیوەشەودا بەکەلەبچەو زنجیری درێژەوە، پۆلیسی سوارە، بەپیٚ و چنگ لەسەر شان، بەهەورازی ئەزمریاندا هەڵگێراو لە چوارتا کەین و بەینەکە تەواو کراو بەبەندکراوی بەرەو شارە نەوتاوییەکەی کەرکوك کرایەوەو بەرگی خاکیان لەبەرکردو ئەمیش لەبەرخۆیەوە دەیوت:

برینی قاچی زامارو دەلاقەی دەوری پۆستاڵم
بەجوتە هەردو بونە تەرجومانی ئێستەکەی حاڵم



بەلام لە سایەی دادگای سەربازیو ویژدانی نەمردوی سەرۆکی ئەو دادگایەوە، پاش ئەوەی لە گاڵتەجاری تەمسیلەکەیان گەیشت، بێتاوان دەرکراو بەپەنجا دیناری بەدەلی ئەوسا رزگاری بو هاتەوە بۆ سلێمانیو روی کردەوە خوێندن، بەلام میری هەر بەرهەڵستی کردو لە ئەنجامدا، دوای هێنانو بردنێکی زۆر، لەسەر بەشداربونی راپەرینەکەی کانونی دوەمی ساڵی 1948 ساڵێك بەندیو ساڵێك دەست بەسەری حوکم دراو، بەندییەکەی لە نێوان بەغدادو کوتو دەست بەسەریەکەی لە پارێزگای (ناصریە) بەسەربردو لە (ئەبوغرێب)دا بەناوی (لە جەرگەی تاریکیەوە) دەڵێت:

**سەربەستی ئەتپەرستم**
**تۆی تاقە خۆشەویستم**
**تۆی ویردی سەر زمانم**
**تۆی ئامانجی ژیانم**
**تۆی ئایینم، تۆی بڕوام**
**تۆی ئاواتم، تۆی هیوام**
**تۆی بیرو هۆشو هەستم**
**تۆی ئارەزوو مەبەستم**
**تۆی قیبلەگای نیازم**
**بۆ تۆ ئاواتەخوازم**
**بۆ تۆ بژیم، بۆت برۆم**
**ئۆباڵێکەو لە ئەستۆم**
**منێکی دیلو یەخسیر**
**هاودەمی کۆتو زنجیر**
**کۆتی دەستو دەمو پێم**
**زرەی نابڕێ لە گوێم**
**بەجۆرێکی گوشییم**
**تا ئێسکی دابڕییم**
**لە زیندانێکی تەنگا**
**تاریکی شەوە زەنگا**
**بن میچەکەی نەوی بێ**
**ژێر راخەرم زەوی بێ**
**خەو زاتی ئەوە نەکا**
**خۆی توشی ئەو شوێنەکا**

**ئەی چۆن ئەبێ زمانم**
**نەڵێ داخی گرانم**
**هەر جارێکە ژیانم**
**تاقە یەکێکە گیانم**
**تالەم ژیانە زیاتر**
**لەم تاقە گیانە زیاتر**
**شاباشی رێگەتی کەم**
**بەفەرشی جێگەتی کەم**

دوای تەواوبونی ئەو خەرجو باجی خەباتە گەڕایەوە سلێمانیو کە دی (کونە مشکیان لێ کردوە بەقەیسەری) بەتەواوی پشتی کردە ئەو تۆزە روناکیو سەربەستیەو خۆی کرد بەگۆمی سامناكو بێ بنی تێکۆشانی نەهێنیداو عەجەب داستانێکی پڕ لە کوێرەوەریو سزاو راونانو خەباتو دەربەدەریو پەژارەو ئارەق رشتنو دان بەخۆداگرتنو خۆبەخت کردنێکی ریخۆڵە بەکێشانە بۆ ماوەی شەش ساڵێکی دورو درێژو بێهەناسەدان، لە ژیانی خۆیدا تۆمار کردو بەسەربردو ژیا.. تا کەوتە بەردەستی میریو بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەندیو سێ ساڵ دەست بەسەری حوکم دراو، پاش ماوەیەی وازی لە سیاسەتو حیزبایەتی هێناو گەڕایەوە بۆ شاری سلێمانیو سەرومڕ کەوتە دنیای شیعرو ئەدەبو رۆشنبیرییەوەو لەم بارەیەوە، وەك یادێکی ئەو دیمەنانەو ئەو سەر گروشتە تاریکانەو باری دەرونیو هەستی شاعیر، لە پارچە شیعری (لە ناخی دەرونەوە) دەڵێت:

**جار جار شەپۆلی هەستێکی بێ بن**
**دێ ئەشلەقێنێ گۆمی بیری من**
**کە دێ شەپۆلی ئەو هەستە قوڵە**
**دەریای دەرونم ئەخاتە جوڵە**
**راپێچم ئەکا بەرەو ڕابوردو**
**رابوردوی وەکو گوڵێك! بابردو**
**ئەو رابوردوەی ناگەڕێتەوە**
**گوڵێ کە سیس بوو ناگەشێتەوە**
**دێنێتە یادم ژینی بەسەرچوم**
**رۆژانی تاریك، شەوانی پێشوم**
**ئەو دەمەی ژیان بۆ هیوایە بو**
**مەبەستی تەنیا بۆ بڕوایە بو**
**گیانم شەکەتو لەش چەوساوە بو**
**کەچی دەرونو دڵ حەساوە بو**
**زیندان تا بڵێی تاریكو تەنگ بو**
**بەرەو روناکی گوێم هەر لە زەنگ بو**
**خوێنی گەرمی جۆش گری خەبات بو**
**ئاگر خۆشکەری ژێر ورەو زات بو**
**هەنگاو ئاراستەی رێیە بو، پیرۆز**
**بەگەل، بەبڕوا، بەمەبەست، دڵسۆز**
**دڵ پڕ لە عشقی میللەت پەرستی**
**هۆی لێدانی بۆ گەل خۆشەویستی**
**دوای ئەوە ورد ورد ئەو بیرو هەستەم**
**ئەمگێڕێتەوە بۆ ژینی ئێستەم**

لەم هاتوچۆیە دەرسیٚ وەرئەگرم

زمانی حاڵە هەتاکو ئەمرم:

هەرگیز نامریٚ باوەری زیندو

بەکارەساتی ئیٚستەو رابوردو

هەر لە سەرەتای شیعر دانانەوە ریٚبازی ریالیزمی شۆرشگیٚڕانەی بۆ خۆی هەڵبژاردوە وەك:

ئەو کاروانە بەرۆژو شەو

لەدو چاوی حەرامە خەو

ریٚگا ونبوی شەوەزەنگە

بەڵام گویٚی لە دەنگی زەنگە

لەسەر ئەو ریٚگایەش لەژیٚر ناونیشانی (بەستەیەك، رازی بلبلیٚك، کوننە پەپو، ئەی کامەرانی، هیوا، خۆشم ئەویٚ، شوانی بیٚ فەڕ، مەردایەتی، ئۆخەی، یادی بیٚکەس، شانازی شەڕ، گەشتیٚك، کاروان، چوار مناڵەکە، دویٚنیٚو ئەمڕۆ، لە جەرگەی تاریکیەوە، رۆژیٚکی نویٚ، ئەو گەلەی، وشکە مەلە، جەژنی دو جەژنە، کاروانی وشە، بەستەی پیٚشمەرگەیەکی نەناسراو، سرودی نەورۆز، دڵیٚکی کۆست کەوتو، یادی ئاوابونیٚك، منیش وتم... هتد) چەند پارچە شیعریٚکی بەرهەم هیٚناوە.

ئەگەرچی لەو شیعرانەداو لە بەرهەمەکانی تریشدا وەك هەویٚن گیانیٚکی رۆمانسیانەی ئاویٚتە کردوە، بەرای خۆیو بۆ چیٚژ لیٚوەرگرتن چەشنە پاراویەکی پیٚبەخشیون. بۆ نمونە لە شیعری (بۆ دڵیٚکی کۆست کەوتو)دا دەڵیٚت:

ئەو بەهارەی مەبەستمە بەهاری ئاسایی نەبو

بەزمو شاییو رەشبەڵەكو هەڵپەرکیٚی لاسایی نەبو

شادمانی لە دەرونا، وەکو کانی هەڵ ئەقوڵاٚ

زۆر دڵی لەت لەتی خەفەت بۆ رۆژیٚکی وا ئەکوڵاٚ

بۆ بەبادانی ئەو خەمەو دەربرینی ئەو خۆشیە

لەو بەهارە پاراوەدا سەیرانو ئاهەنگ جۆشیە

شەپۆلی مناڵو مەزن، بەهەزاران سەیران کەران

رۆحیٚکی تازە بابەتی بەخشی بو بەگەشتو گەڕان

هەرچی کە پیٚی بڵیٚی درکی ناسۆری لە باخا نەبو

لەبەر گزنگی ئەو خۆرە پەژارە لە ناخا نەبو

کەچی لەپڕ گوڵیٚکم دی بەدو نیٚرگسی مەستەوە

بەلیٚویٚکی بەبارەوە، چەپکە گوڵی بەدەستەوە

بەبەرگو رەنگو شیٚوەیا ماتەمینی لیٚئەڕژا

بەپشکۆی کۆستیٚکی گران دیار بو کە دڵی ئەبرژا

ئەو دڵەی کە چەپکە گوڵی دیاریەکەی پیٚوە نوسابو

ئەو دڵەی کەوا برینی نەهیٚنی تیٚوە ئاڵاٚ بو

بەناو شەپۆلی هەڵپەرکیٚو پیٚکەنینی ئەمو ئەوا

بەرەو درەختیٚ تیٚپەڕی، وەکو بیبینم لە خەوا

لەو سیٚبەری درەختەدا، لەسەر بەرزایی ئەو گڵە

بەکڕنوش و بەریٚزەوە دایئەنا ئەو چەپکە گوڵە

لەسەر گۆڕی دەسگیرانە دڵدارە جوانە مەرگەکەی

لەسەر دەمی جیٚ برینی سنگی لاوە بەجەرگەکەی



وەك سەرنجو بایەخیٚکی ئەدەبی لە شیعردا، مەسەلەی دەرونو ئەو شەپۆلو لافاوانەی لەو دەریایەدا هەنو بەیەکا دەچنو لەبەرئەوەی کە پەیوەندیەکی ژیاوی نەپچڕاوی رۆژانەیان لەگەڵ مرۆڤدا هەیە، جا ئەو مرۆڤە چ شاعیر خۆی بیٚتو چ پاڵەوانانی ناو شیعرە دەرونیەکان، لەم روەوە کۆمەڵیٚك شیعری بابەتی دەرونی هەیەو تا رادەیەك رەنجو تەقەلاٚی ئەدەبی خۆی بۆ تەرخان کردوە. وەك (شیوەنی پاییز، کامیانە، سەرنجیٚك، نەخۆشی باییبون، دوربینی، بەردیٚك، تیٚبینی، بادەی خەم، هەناسەیەك، بەراوردیٚك، بەسەرهاتیٚك، لەناخی دەرونەوە، بڵقی سەر ئاو، منو پاییز، تاسەیەك، مامۆستا گیان.. هتد) کە بەشیٚوەی ئاویٚتەکردنی بیری فەلسەفیو جار جارەش بەرەمز دیٚنە زمانو لە ریٚگای دەربڕینو دیٚنەوە مەبەست بەدەستەوە دەدەن.

پارچە شیعری (بڵقی سەر ئاو) وەك بابەتی دەرون، لە حەقیقەتی مرۆڤی هەلپەرستو بیٚبار دەدویٚت، ئەوانەی کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەمو نەنگیەك قوت دەدەن بەمەرجیٚك بەرژەوەندی خۆیانی تیا بیٚت: شەریکی دزو هاوڕیٚی کاروانن، لە شینی مەڕدا سەر بەقوڕو لە شایی گورگدا سەرچۆپی کیٚشنو هیچ فو لە دو ناکەن:

بەسەرژمیٚر خۆی یەکیٚکە لە بەرچاو

کەچی پەلکەزیٚڕینەیە بەهەناو

بەپیٚی شویٚنو بەپیٚی هەواو بەرژەوەن

گیٚرە ئەکاو خەرمانەکەی ئەکا شەن

بەڵام ئاخۆ ژیان هەر بەم چەشنەو تا سەر دەچیٚتە سەرو هەر بەکامی دڵی هەلپەرست ئەم چەرخە دەسوڕیٚتەوەو دەڕوات، نەخیٚر.

بەڵام ژیان، ژیانی راستەقینە

زۆر لەم بڵقی سەرئاوانە بەقینە

ریاکاری، خۆپەرستی، ترسنۆك

ئەمڕۆ، سبەی، ئەبیٚ هەر دابدا چۆك

خۆشەویستیش، وەك هەویٚنیٚکی پیٚویستی بەرهەمی شیعر، ئەگەرچی شیعری کەم پیٚوتوە، بەڵام بەشیٚوەیەکی قوڵو بنج بەست هەر هەیەو لە چەند شیعریٚکدا رەنگی خەستی داوەتەوەو گەیشتۆتە پلەی سۆفیگەریو پەرستنی تەواو، وەك:

ئەی فریشتەی خۆشەویستی

خۆشەویستی پاكو بیٚگەرد

کەوتومەتە تۆ پەرستی

لە ئاسمان بیٚ یا لەسەر عەرد

خۆشەویستم
ئەتپەرستم
بەتۆمەستم
بێ تۆ پەستم
بەو چاوە جوانانە قەستەم
بێ تۆ ژیانم ناخۆشە
ناخێ ئەم دەرونە پەستەم
بۆ روناکی تۆ پەرۆشە
پەریزادە
دڵ بەربادە
زۆر ناشادە
خەمی رادە
هەرچەن شێوەی تۆ ئەبینم
لە جوانی تێر نابێ چاوم
بەبێ تۆ شۆخی شیرینم
گوڵێکی سیس و ژاکاوم
بێ رەنگ و بۆ
بێ گفت و گۆ
بێ هات و چۆ
دەستەو ئەژنۆ
ئەی فریشتە نازدارەکەم
تۆ چرای من پەروانەتم
ئەی تاقە وەفادارەکەم
کوشتەی ئەو تیشکە جوانەتم
هەتا ئەمرم
تۆ پەروەرم
نازت ئەگرم
لەسەر سەرم

یان ئەوەتە لە شیعری (بۆچی نابێ)دا بەوپەڕی بێپەروابییەوە دەڵێت:

خواپەرست بم، لە خوا زیاتر
خۆم خۆش ئەوێ
ئەگەر دنیا پەرستیش بم
زۆر زۆر لەم دنیایە زیاتر
خۆم خۆش ئەوێ
ئەزانی بۆ؟ نازدارەکەم!
ئەوەندە من خۆم خۆش ئەوێ:
لەبەر تۆیە تۆم خۆش ئەوێ
پەیکەری خۆشەویستی بم
بۆچی نابێ
تا ئەم دنیایە دنیا بێ
هەر بمێنم
هەر بمێنم
هەر بمێنم

خۆشەویستی نەتەوەو خاکی کوردستان و، بەتایبەتی چینە چەوساوەکانی کورد، بەشێکی دیاربوی بەرهەمی گرتوەو شەقڵی تایبەتی خۆی لە خەرمانی ئەو رەنج و تەقەلایە داوە ئەویش بەشیعری (کامیانە، خۆشم ئەوێ، مەردایەتی، یادی بێکەس، گەشتێك، لە زمان جوانەمەرگێکەوە، کوردستان، هەتاکەی، بۆ هەڵۆ، هەستێکی پیرۆز، ئەو گەلەی، لە یادی شێخ سەلامدا، جەژنی دو جەژنە، کاروانی وشە، یادی پیرەمێرد، بەستەی پێشمەرگەیەکی نەناسراو، سرودی نەورۆز، دڵێکی کۆست کەوتو)دا، کە تێکرا وەك بابەتێکی ریالیزمی شۆڕشگێڕانە مۆرکی تایبەتی نەتەوایەتیان پێوە دیارە:

ڕێبوارێکم
بەسەر هەورازی توتڕکا
هەڵئەگەڕێم
بەڕێی کاکێشانی دڕکا
هەنگاو ئەنێم
بەڕێگادا
گۆماوی خوێن بەجێدێڵم
لە دنیادا
بەشوێن مەبەستێکا وێڵم
چەندان خاوەنی تاتەشۆر
بەرۆکیان ئەگرتم بەزۆر
گۆڕهەڵکەنانی زەبرو زەنگ
لێیان هێنامە ژارو ژەنگ
نەخاوەن گۆڕ، نە تاتەشۆر
توانیان من بنێنە گۆڕ

هەر لە زوەوە، لە شەستەکانەوە، وەك هەستێکی بەرزی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ و بایەخ و برەوی پێویست بەئەرکی ئەدەبی بابەتی منداڵانە، ئاوڕی لەم لایەنە گرنگە داوەتەوەو وەك شتێك زۆر بەپێویستیەکی تەواوی سەرشانی داناوەو لەم جیهانەدا چەند تاقیکردنەوەیەکی شیعری ئەم بابەتەی هەیەو تا ئێستا لەدو نامیلکەدا بەناوی چرۆو شێری ساختەوە دو کۆمەڵی لێبلاوکردونەتەوە، بێجگە لەوەش کە کۆمەڵێکی زۆری چاپ نەکراوی هەیەو نیازی وایە بەناوی (جگەر گۆشەکان)ەوە لە دەرفەتێکدا بلاویان بکاتەوە. منداڵ، وەك بەچکە مرۆڤێکی زۆر پاك و تەواو پیرۆزو سادەو خۆشەویست گۆشەیەکی پڕ بایەخی لە دڵی ئەمدا گرتوە:

وێنەی ئەو بابەتە بەرهەمەش ئەم دو پارچەیەی خوارەوەیە:

1-هەنگەکەم

ئەی هەنگی ویزە خۆشم
وەکو تۆ تێدەکۆشم
چاوم لە تۆیە وردی
ئای چەن بەدەست و بردی
جێی بەرز ئەدۆزیتەوە
هەڵاڵە دەچنیتەوە
شیلەو هەڵاڵەی بۆن خۆش
دەکەی بەهەنگوینی نۆش
منیش ئەی هەنگ! وەکو تۆ

رەنجم گرتۆتە ئەستۆ
بەرەو ئامانجی شیرین
شیرینترە لە هەنگوین

2- پشیلە سورە
پشیلە سورە خت، خت
بۆ خۆت لێ کردوم بەشت
ئەی خاوەن چرنوك و قەپ
لە تۆ نایە گاڵتەو گەپ
برۆ میاومیاوی چیتە
سەر زنەی سمێڵ قیتە
ئەی چاوبزەی چاوشینە
دڵم لە تۆ بەقینە
چاوم لە تۆ بو دوێنێ
وەکو چەقەڵ لە شوێنێ
بەودەست و پێ چەپەڵە
کەوتیتە شوێن جوجەڵە
جوجەڵەی جوان و خرپن
وەك من بچکۆلەو گوپن
لاچۆ برۆ لە بەرچاو
ئەی کەتن کەری گلاو

هەرگیز شیعرو منداڵ لە یەکتری جیاناکاتەوەو لای وایە کە چۆن منداڵ پیرۆزەو دروست دەبێت و ژانی هەیەو ژیانی هەیەو گەورە دەبێت و جێگای شیاوی خۆی لە مەیدانی گەورەی ئەم ژیان و بۆنەدا دەکاتەوە شیعریش بەو پلەو قۆناخەدا دەڕوات و دروست دەبێت و دەژی و هەناسە دەدات و کاردەکات:

شیعر لای من مناڵێکە زادەی هەناوە
باڵداریکەو لە هێلانەی ژانا خوڵقاوە
گەوهەریکە، بەناو دەریای ئازارو دەردا
دەبێ بچم، تیر بگەرێم، تاکو سەرهەڵدا
شیعریش وەك تۆ[3] کۆرپەیەکە نازدارو ساوا
وەکو پشکۆ گەش دەنوێنێ لە تین و تاوا
شیعر لای من بزەی لێوی قاقای زامێکە
وەکو نیشان لەسەر سنگی ری و پەیامێکە
شیعریش دەبێ وەك تۆو ژیان تینوی تاسەبێ
بەر لە هاتن خاوەن جوڵەو بای هەناسەبێ

کەواتە وەك هەوێن و ناوەرۆکی ئەدەبی، دەردو ئازارو چەوساندنەوەی هەژارو لێقەوماوەکان، زۆرو ستەمی زۆردارو خوێن مژ، دیمەنی رازاوەی کوردستان و خۆشەویستی مرۆڤی کورد، جوانی و خۆشەویستی، دەرون و شەپۆلە هەمەچەشنەکانی، سەربەستی و ماف و بایەخی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، کاروباری کۆمەڵایەتی، منداڵ و جیهانە تەلیسماویەکەی، لە بەرهەمەکانیدا سەرجەم هەن و جێگیرن.

تا ئێستا چەند نامیلکەیەکی شیعری بڵاوکردۆتەوە: 1-سۆزی دەرون 2-لەگەڵ شەپۆلەکانا 3-چرۆ 4-شێری ساختە.. ئەمە جگە لەوەش کە سەرلەنوێ دیوانی مەولەوی، کە پیرەمێرد گۆڕیویەتیە سەر شێوەی کرمانجی خوارو: (مەم و زین، گاڵتەو گەپ، پەندەکانی پیرەمێرد بەسێ بەرگ، چوارینەکانی نەخەعی، روباعیاتی خەیام)ی چاپ و بڵاوکردۆتەوە.

لە حەفتاکانیشدا، دوای رەنج و تەقەلایەکی زۆرو ماندوبونێکی تەواوی دەست لە ئەنجام شۆڕانە، توانی ئیمتیازی رۆژنامەی (ژین) بگرێتە دەست خۆی و بۆ ماوەی چوار ساڵ هەمو هەفتەیەك دەری بکات و پشت بەکۆمەك و یارمەتی و بەشداربونی نوسەرانی بەڕێزی کورد بەرێك و پێکی ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیە بخەملێنێت و چاپخانەیەکی بچکۆلەی بەناوی (چاپخانەی کاکەی فەللاح)ەوە بۆ بسازێنێت و لەپاڵ رۆژنامەکەشدا کۆمەڵێك بەرهەمی کتێبی بەکەڵکی کوردی ئەم و ئەو بخاتە ناو کتێبخانەی کوردییەوە.

لە مەیدانی رۆژنامەگەریدا توانی، وەکو وتمان، ببێتە خاوەنی رۆژنامەی (ژین)و بەتاقی تەنیا ئەرکی هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردن و نوسین و پڕکردنەوەو دەرچون و پاراستنی رادەو بەرزبونەوە ئاست و چارکردنی هەمو گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمە سەختە ئاشکراو نەهێنیەکانی رۆژنامەگەری و چاپخانەی گرتە ئەستۆو ملی ناو ئێستەش ئەندامی کارای نەقابەی رۆژنامەنوسانی عێراقەو ئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاری کوردە.

لە شیعرو ئەدەب و تێکڕا ژیاندا باوەری بەگۆڕین و پێشکەوتن و نوێبونەوە هەیەو نوێ لە مناڵدانی کۆندا دروست بوەو رەوا نیە وەك سامان و کەلەپوری نەتەوایەتی، نەهەموی فرێبدەین و نەباوەشیش بۆ هەموی بگرینەوە.. راست وایە تەنها سامانی باش و بەکەڵك و زیندو بقۆزینەوەو ئاوێتەی بەهرەو هونەرو چێژو پێزی خزمەت و بەرهەمی سەردەمی خۆمانیان بکەین و لایەنە رزیوو مردوەکانیش پشت گوێی بایەخ و رەنجمانیان بخەین.. بۆیە لەم بارەی بەراوردی (دوێنێ و ئەمڕۆو سبەینێ)یەوە دەڵێت:

ئەمڕۆ کە زادەی دوێنێیە
رێگای بەرەو سبەینێیە
هەر لەبەرئەوەی ئێستایە
تەمەنێکەو لە دەستایە
ئەبێ ئەو رەنجە درابێ
باخچەی وەك دوێنێ نەمابێ
گوڵەکانی بۆنخۆشتر بن
مەلەکانی دڵخۆشتر بن
دوربێ لە درك و داڵی خەم
دای نەپۆشێ ئاسمانی تەم
ئەبێ هەنگاونانی دوێنێ
بەمڕۆی دابێ رێگاو شوێنێ
باخچەی ژین رازاوەتر بێ
گەلاو گوڵ گەشاوەتر بێ
سایە گەورەو سێبەر سەخت بێ
هیوا پڕ پێستی مەبەست بێ
ئەبێ تۆوی زەوی دوێنێ
ئەمڕۆ خۆشی لێ ببینێ
ئەمڕۆش گزنگی ژیانی
روناکی با بە بەیانی

لەناو شاعیرە کلاسیکیەکاندا زۆرتر بابەتایەری هەمەدانی و مەحوی و مەولەوی و نالی و حەمدی دەخوێنێتەوەو لەگەڵ بەرهەمەکانیاندا دەژی و لە

شاعیرانی ئەم چەرخەش (گۆران)ی هەرەتەواو، وەك بلیمەتێکی هەڵکەوتو، بەدڵە.. سەرجەم شیعری شاعیرە لاوەکانی ئەم سەردەمەی کوردیش بەتاسەوە دەخوێنێتەوەو چێژیان لێوەردەگرێت. لە شاعیرە عەرەبەکانیش بەیاتیو سەییابو مەلائیکەو قەببانیو مەحمود دەروێشو ئەدۆنیس سەرنجی راکێشاونو زۆرتر دەیان خوێنێتەوە، شاعیرە جیهانیەکانیش: نازم حیکمەتو نیرۆداو مایاکۆفسکیو ئەراگۆنو لۆرکا، مایەی بایەخ پێدانو جارجارەش وەرگێڕانی بەرهەمەکانیانە بۆ شیعری کوردی، بەتایبەتی شیعرەکانی نازم حیکمەتو پاپلۆ نیرۆدا پورەهەنگی هەستو تاسەی چ بۆ چێژ لێوەرگرتنو چ بۆ وەرگێڕان دەوروژێنن، وەك ئەم پارچە بچکۆلەیەی نازم حیکمەت:

جوانترین دەریا، ئەو دەریایەیە
کە تاکو ئێستا مەلەی نەدیوە
جوانترین ساوا، ئەو ساوایەیە
لێوی گەورەیی پێنەکەنیوە
خۆشترین رۆژمان، ئەو رۆژەیە وا
بەژینی ئێمە رانەچەنیوە
جوانترین وشەش کە بە تۆی بڵێم
ئەوەیە لە دەم هەڵنەوەریوە

باوەڕی وایە کە شاعیری ئەمڕۆ، وەك شاعیرانی دوێنێ، هەر بەسەلیقەو بەهرەی ڕوت نابن بەشاعیرو، بەڵکو پێویستە لەسەریان کە بڕشتی بەهرە لە سایەی خۆماندوکردنو خوێندنەوەی هاوچەرخانەو تاقیکردنەوەی خۆییو خەریك بونەوە ئاوبدەنو گەشە پێبکەنو ئەمەش نایەتە دی هەتا شاعیر خاوەن فەلسەفەو بیری ڕوناكو سەربەژیانو هیواو پێشکەوتن نەبێت.

## سەرچاوە

کاروانی شیعری نوێی کوردیی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەلاح، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی- بەغداد- چاپی یەکەم 1978.

## پەراوێز

(1) پێم وایە نوسەر یان شاعیر لە سەرخۆی شت بنوسێت ئەرکێکی ئاسانو خۆش نەبێتو لەوانەیە دو دڵیو سستی رو بکاتە دەستو قەڵەمەکەیو زۆر لایەن، هیچ نەبێ بەدورو درێژیەکی پێویست، ڕون نەکاتەوەو خەڵکیش، بەتایبەتی لەوانەی کە خۆیان بەشاعیر دادەنێن، یان خەڵك بەشاعیریان دەزانێت، کەمێك لە دڵەوە لەبەرشانیان گران بێت.

بەڵام دوای وردبونەوە لەم چەشنە لایەنو خاڵانەو هەڵگرتنی بناونی مەبەستو بەستنەوەی جەمسەری تێبینیەکانو گەیشتنە ئەو شتەی پێی دەڵێن قەناعەت، بڕیارم دا کە هەروا سەرپۆتێکی کورت دەربارەی ژیانو نمونەی شیعرو قۆناخی گۆڕینو بایەخی ئەدەبیو بۆنەو هۆی وتنی شیعرەکان، وەك ئەوەی هەیە ڕون بکەمەوەو پەنجەیان بۆ ڕابکێشم. ئەویش هەر سەبارەت بەوەیە کە شیعر دەستێکی زۆری لە کارەساتو بەسەرهاتی ژیانی مندا هەیەو، جگە لەوەش وەك بەرهەم، شیعرێکی زۆرم داناوەو لە ژیانمدا لەگەڵ شیعرو شیعر وتندا هەڵسو کەوتێکی زۆرم کردوەو هەمیشە لەگەڵیدا ژیاومو هاتومو دەڕۆم.

لایەن و هەڵسەنگاندنو تاوتوێ هونەری شیعرو پلەی بەهرەو کاروباری شێوەو زمانو هەوێنو کەرەسەو شێوازو هەمو گەوهەرە بنەڕەتیەکانی شیعری خۆم بەجێدەهێڵم بۆ رەخنەگرانو لێکۆڵەرەوان... لەم نوسینەدا تەنها مەبەستم رون کردنەوەی چەند کەلو قوژبنێکی ژیانو بەسەرهاتو پێشکەشکردنی چەند نمونەیەکی شیعریو بۆنەو هۆی دروست بونو لە دایك بونی ئەو شیعرانەو دەست نیشان کردنی هەوێنەکانە وەك ناوەڕۆكو بەس..

(2) دکتۆر ئیحسان فوئاد دەڵێت: کاکەی فەللاح شاعیرێکی تازە کۆرەنیە، تا من بتان ناسێنم بەبەرهەمەکانی، بەڵکو هەر لە ساڵانی 1948-1949و هۆنراوەی ئازادی خوازانەی وتوە، بۆیە کڵاوەکەی بەدەستی کۆنەپەرستو کاربەدەستانی ئەو سەردەمە خواربوبوەوەو درابوە بەر چەپۆك. ئێستاش خاوەنی چەند دیوانێکی بەسودە گۆڤاری برایەتی ژمارە 7ی ساڵی 1970 ل27.

(3) مەبەستی کۆڕپەیەکی خۆیەتی کە ئاودێری ناوە.



# دەربارەی ئەدەبی کوردی[1]

**نوسینی: کاکەی فەللاح**

ئەدەبی کوردی ئەم بەشانەی گرتۆتەوە:

1-ئەفسانەو چیرۆك و داستان.

2-ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی کەلە کۆنەوە بەسەردەمی پیرەکانەوەن.

3-ئەدەبی گۆرانی کە چیرۆکی شیعریو پارچەی تایبەتی دەگرێتەوە کە بەبۆنەی شینو شادییەوە گوتراون.

4-شیعری نوسراو.

کۆنترین شاعیری ناسراوی کورد (عەلی تەرمۆکی)یە کەلە سەردەمی دەیەمی زایندا ژیاوە، شیعری زۆر بەسۆزی هەیە، لە بابەتی دڵداریو نیشتمان پەروەری، چەند پارچەیەك لە شیعرەکانی لەلایەن ئەدیبەی فەرەنسی (لوسی پۆل مارگریت)و کامەران بەدرخانەوە کراون بەفەرەنسی.

بابەتایەری هەمەدانیش (عوریان) هاوچەرخی ئەو بوە کەلە ساڵی 1035زدا کۆچی دوایی کردوە، شاعیرێکی گەورەو سۆفییەکی تەواو بوە، زۆر سۆزی گەرمو گوڕی سۆفییانەی ناو دڵو دەرونە روناك و گەشەکەی، بەشێوەی چوارینی بەرزو ناسك و بەئاوازو هەست لە چوارچێوەی شیعردا دارشتوە.. بەجێیە ئەگەر لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئەو چوارینانەی دەدەنە پاڵ زمانی فارسی، بەڵام راستی مێژوییو فیلۆلۆژی وای ساغ کردۆتەوە کە ئەو لەهجەیەی چوارینەکانی پێ نوسراون لەهجەی لوڕی کوردییە.. ئەوەی کە لەم روەوە پشتی ئەم قسەیەمان دەگرێت بەوەی کە ئەو چوارینانە فارسی نین، رۆژهەڵاتناسی گەورە (ادوارد جرانفیل براون) لە کتێبەکەیدا (مێژوی ئەدەب لە ئێران)دا. لەو سەردەمەشدا ناوی (عەلی حەریری) 1010-1077و فەقێ تەیران 1307-1375 کەلە ناوچەی حەکاری کەلە رۆژهەڵاتی تورکیای ئێستایەو ئەحمەدی باتێ 1417-1495 کەلە ناوچەی هەورامانە دەدرەوشێتەوە.. شیعرەکانی پیری شالیار کە یەکێك بوە لە پیرەکانی ئاینی زەردەشتی ئێستەش بەسەردەمی زۆر لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیەوەیە.

شێخ ئەحمەدی جەزیری شوێنێکی دیاربوی پێشەوەی لە ئەدەبی کوردیدا بۆ خۆی گرتوە، بەوەی کە شیعرەکانی بەردی بناغەی شیعری کلاسیکین، بەشێوەی دەربڕینی رەوانو دارشتنێکی پتەو کەلەسەر دەریا ناسراوەکانی کێشی عەروزی عەرەبین، ئاوێنەی شیعرەکانی گیانی عەشقی خودایی پیشان دەدات، بەچەند دەربڕینو وشەیەکی دامەزراو کە هەمو بەڵگەو نیشانەکانی جوانی گرتۆتە خۆی بەهەمو هونەرەکانی رەوان بێژییەوە.. بەڵام (ئەحمەدی خانی شاعیر 1650-1706) کەلە شاری بایەزیدی کوردستانی تورکیا لە دایك بوە، بەداستانە شیعرییە بەرزەکەیبەناوبانگە کە ناوی (مەمو زین)ەو بەپێشەکیەکەی کە یەکەمین بابەتە لە شیعری نەتەوایەتیداو ئاگری هەڵچون خۆش دەکاتو شاعیر هەوڵی داوە کەلەباری سیاسی کورد بکۆڵێتەوە.. ئەم داستانە بەچەند زمانێك وەگێڕاوە یەکێك لەوانە عەرەبییە کە مامۆستا محەمەد سەعید رەمەزان بوطی وەرگێڕاوە.. کە دەگەینە چەرخی حەڤدەیەم، ناوی شاعیرانی گەورە گەورە دەکەونە بەرچاو لە وێنەی (مەلا مستەفای بێسارانی 1641-1702)و (خانای قوبادی 1700-1759)و (مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزوری 1777-1836)و (مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی 1746-1807) کە زۆربەی شیعرەکانی بەعەرەبی داناوەو لە شاری (أحسا ء) کۆچی دوایی کردوەو (محەمەد ئاغای دەربەند فەقەرە 1765-1832).

لە چەرخی نۆزدەیەمیشەوە چەند گەنجینەیەکی ئەدەبی گەورەی شاعیرانی ناودارمان بۆ بەجێماوە: وەك (نالی 1797-1855)و (مەولەوی 1806-1882)و (سالم 1800-1866)و (مستەفا بەگی کوردی 1809-1849)و (حاجی قادری کۆیی 1815-1892)و (مەحوی 1830-1904)و (شێخ رەزای تاڵەبانی 1835-1909)و زۆری دیکەش.

لەگەڵ سەرەتای چەرخی بیستەمیشدا ئەدەبی نوێ دەرکەوت لە نوێنەرو قارەمانەکانی (پیرەمێرد 1867-1950)و (یونس رەئوف دڵدار 1918-1948)و (زێوەر 1875-1948) بون ئەمانە بەشی زۆری کۆتو زنجیری لاساییان لە شیعردا شکاندو واتای نوێیان داهێناو چەند بابەتێکی پێشکەوتوانەی هاوچەرخەیان نوسی.. هەروەها پایەی پەخشان جێگیر بو بەوەی کە چەند گۆڤارو رۆژنامەیەکی کوردی لە عێراقو تورکیاو سوریاو ئێراندا هاتنە کایەوە.. چەند نوسەرێکی بەهرەدار دەرکەوتن وەك (محەمەد ئەمین زەکی 1880-1948)و (جەلادەت بەدرخان 1897-1951)و (محەمەد عەلی کوردی)و (عەبدولواحید نوری کەلە ساڵی 1944دا کۆچی دوایی کرد)و (حسێن حوزنی موکریانی 1886-1947)و (شاکر فەتاح)و (شێخ محەمەدی خاڵ)و (مەلا جەمیل رۆژبەیانی). بەڵام چیرۆکی نوێی هونەری سەرنەکەوتو شێوەی تازەی ئێستای وەرنەگرت، سەرەرای تەقەلای نوسینی سەرەتای دەست پێکردنی، لەم بیست ساڵەی دواییەدا نەبێت، واتە لە ساڵی 1940ز بەم لاوە... چەند چیرۆکنوسێکی نایاب دەرکەوتن، ئەگەرچی بەرهەمیشیان کەمە: وەك (عەلائەدین سەجادی)و (ئیبراهیم ئەحمەد)و (حەسەنی قزڵجی)و (محەمەد مەم)و (مەعروف بەرزنجی)و (مستەفا صالح کەریم)و (محەررەم محەمەد ئەمین)و (میدیا)و (حسێن عارف)و (جەمال عەبدولقادر بابان)و چەند کەسێکی تر.

مامۆستا (گۆران) سەرۆکی قوتابخانەی شیعری نوێیە، بەرەنگو شەقڵی واقیعیو هونەری نوێیەوە. هەروەها ناوی چەند شاعیرێکی هاوچەرخ لەم رووەوە دەدرەوشێتەوە: وەك (ع. ح. ب)و (ئەحمەد هەردی)و (محەممەد صالح دیلان)و (کاکەی فەللاح)و (کامەران)و (عەلی دزەیی).

چەند شاعیرێکی تریش هاتنە پێشەوە کە قورسایی پێداگرتنو بایەخی خۆیان لەسەر ئەدەبی میللیو دواندنی راستەوخۆی جەماوەری خەڵکی تەرخان کردوە بۆ وروژاندنی هەستو وریاکردنەوەیان لە گیروگرفتی نیشتمانیو نەتەوایەتیو کۆمەڵایەتی: وەك (جگەرخوێن)و (هەژار)و (قانیع)و (دڵزار). زانستی مێژوی ئەدەبیش، بەشێوەیەکی هاوچەرخانە لە ساڵی 1950وە دەست پێدەکات. لە پێشڕەوانی مێژونوسانی ئەدەبی کوردی مامۆستا (رەفیق حیلمی)یە کە کتێبێکی







بەدو بەرگ داناوە لەژێر ناوی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)دا، بەرگی یەکەمی ساڵی 1941 چاپ کردوە، کەلەسەر نوسین و لێکۆڵینەوەو ڕەخنەیە لە شیعرەکانی چەند شاعیرێکی ناسراو. بەرگی دوەمیشی ساڵی 1956 چاپ کردوە کە تەواوکەری بەرگی یەکەمە. هەروەها مامۆستا (عەلائەدین سەججادی)شە کە کتێبێکی لەژێر ناوی (مێژوی ئەدەبی کوردی)دا داناو لە ساڵی 1952دا چاپی کردو بلاّوی کردەوە کە کتێبێکی نایاب و بێوێنەیە.

## پەراوێز

(1)ئەم نوسینە لە ساڵی 1963دا، وەك سەرەتایەکی کورت، لیژنەی ئەدەبی کوردی لە یەکێتی ئەدیبانی عێراقدا بەعەرەبی بۆ ئەو نامێلکەیەیان نوسی کە بەناوی (هەڵبژاردە لە ئەدەبی کوردیدا) دەریان کرد، بەلاّم بەداخەوە روناکی نەدی و لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی






# هەندێ شیعری هەمەچەشنی کاکەی فەلاح

**نووسین - وەرگێڕان**



### پڕپیشکەکان

شیعری (ئاراگون)ی شاعیری گەورەی فەرەنسایە

(1)

واز لە سکالاَ بێنە
هیچ شتێك لەوە زیاتر
مایەی گاڵتە پێکردن نییە
کە مرۆڤێك بکرووزێتەوە
ئەگەر نەگری

(2)

بڕوام پێبکەن
هیچ شتێك
بەقەدەر بیر کردنەوە
ژان کێش نییە

(3)

هەرچەندە شیعر
کورت تر بێ
چاکتر بەناخی دەروونا
ڕۆئەچێت

(4)

با ئەم شاعیرە
شار بەدەر کەین
چونکە لە شارەکەدا
جێگای ئەم جۆرە
ژانە نابێتەوە

(5)

ئەسووڕێمەوە
نووکی نێزە لە دەروونم چەقیوە
ئەسووڕێمەوە
شتێك لە خەیاڵمایە
ئەسووڕێمەوە
بەگوڵدانێکی گوڵی سیس و
ژاکاوەوە
بەچەند وێنەیەکی
بچووك کراوەوە
ئەسووڕێمەوە

بەجل و بەرگی کۆنەوە
ئەسوورێمەوە
کوونێکی گەورە لە دڵمایە
(6)
هەموو شتێکمان بۆ ئەوانە
دروست کردوە کەوا ئەخنکێن
هەموو شتێك بۆ ئەوانەی
هەناسە بدەن
پەنجەرەمان بەسەر شەوا
بەرز کردۆتەوە
لە هەموو شوێنێك
داڵدەمان کردۆتەوە
ئێوەش رەگی سکاڵامان ببڕن
(7)
هەرگیز
هیچ شتێك
لە زەردەخەنە جوانتر نییە
با لەسەر روویەکی
شێواویش بێت
ئایا ناتانەوێ جوان بێت؟
(8)
ئەم هەنگاوە بریندارانە
دوور خەنەوە
(9)
چەن پێت رەوایە
چاو وەرگێڕی
لەو شتانەی خوێناوین
(10)
هەموو شتێك بەتەواوی
لە شوێنی خۆیایەتی؟
یان هیچ نەبێ وا ئەبێ؟

(11)
ئەی دەرۆزەکەر
دەستە ڕاکێشراوەکانت بشۆ
(12)
کێ ئەڵێ من ئازار ئەکێشم؟
ئەوانم لە بیر ئەچێتەوە؟
(13)
بێ دەنگ بوونت بەس نییە
بەڵکوو پێویستە بزانی
شتێکی تر بڵێیت
(14)
ئەو درەختە، بەنەفرەت کراوە
ئەگەر چاو شادو دڵخۆش نەکات
هەروەها شاعیریش مافی مانەوەی نییە
ئەگەر گوڵ دەرنەکات
(15)
هیچ زامێك نییە
ئەگەر کەمێك جوانی بکەین
دەمێکی لێ نەیەتە دی
هەروەها هاوارێك
نەتوانین بیگۆڕین
تاقانە تاوان:
رێك نەخستنی ئاوازەکانە
(16)
قسە بۆ ئەو کەسانە ئەکەم
کە ناتوانن بخەون
ئەوان بەتەنیا نین
مادام لەوان ئەچم
هەروەها قسەش بۆ ئەوانە ئەکەم
حەز ئەکەن بمرن
بۆچی ئەڵێن:
من خۆپەرستم
(17)
ژیان پڕە لە پڕیشك
بەڵام لەگەڵ ئەوەشا
هەر ژیانە
(18)
جار جار جێی خۆیەتی
لە شەوا هاوار کەین
(19)
جارێکی تر چاوی منداڵە مردوەکان
نایەڵێ لەمڕۆ بەدواوە
ئاوێنە ببینێ
(20)
ئایا ئەزانی؟
وشەی شەرمەزاری چییە
(21)
هەوڵ بەن
ئەم وشەیەی لە خەبجەر ئەچێ
ئاوێتەی بەیتی شیعرێکی فەرەنسی بێت

## منیش وتم

1977



پێیان وتم: بخۆرەوە، بخۆرەوە، بخۆرەوە
ژەنگو ژاری دەروونەکەت بشۆرەوە
هەتا ئەتوانی بەبادە
خەرمانی خەفەت بەبادە
وەك ئەوانەی هاوزامی تۆن
سارێژ بە بە شەرابی کۆن
هەرچی خەمو خەفەت هەیە
لەشکر بێ شکستەی مەیە
هەرچی هەوری ڕەشو تاڵە
پەرتی دەس شەرابی ئاڵە
هەرچی کەوا گەردەلوولو رەشەبایە
گێژەڵووکەی ئەمسەرەو سەری دنیایە
لە دەست تەلیسمی بادەدا
وژەی نایە
دەنگی نایە
کەواتە تۆ بخۆرەوە، بخۆرەوە، بخۆرەوە
منیش وتم: ناخۆمەوە، ناخۆمەوە، ناخۆمەوە
ئەوانەی کە دەخۆنەوە
تا خۆیان بیر بچێتەوە
تا خەمیان بیر بچێتەوە
لاوازن هەر لە کۆنەوە
حەز لە هەستو ژیری ناکەن
لە چەشنە بادەیەك ناگەن
کە چۆن لە پیاڵەی ژیرییا
یەك بینە خۆم ئەخۆمەوە
تا ماوم خۆم ئەخۆمەوە

***

## لە پاڵ کێلێکدا

کۆتایی 1977

یەکەم دەنگ:
سەمەندەرێ
ڕۆژێ بەقەقنەسێ گەیی
وتی: وەرە با منو تۆ
بەزمانی وەك ژیلەمۆ
چیرۆکی ئاگراویمان
بنووسینەوە بەپشکۆ
لە کۆنەوە
لە مەڵبەندی هەزاران کاتو شوێنەوە
وتوویانەو دەیڵێنەوە:
کە سەمەندەر
وەك خدرو ئاوی ژیان
هەڵقولاوی ئەفسانەیە
پەلەوەری بێ لانەیە
مەلێکی بێ هێلانەیە
وەك چۆن ماسی هەر لە ئاوا
توێشە بەرەی ژیانی دەپێچێتەوە
ئەم تەواو پێچەوانەی ئەو
بەرۆژو شەو
بۆی بگەڕێن
لە شەپۆلی گڕی سوورا
دەی دۆزنەوەو
بەسەرهاتی دڵداری لەگەڵ ئاگرا
وەك چەپکە گوڵ
وەك شیعر دەهۆنێتەوە
تەنها لە هێلانەی پشکۆی گەشاوەدا
دەبێو دەژیو دەزێو دەمرێ
ئەم بوونو ژینو زایینە
بلێسە نامەی ئایینە
هەمووی بەسەرهاتی منە
کەلە زۆر سەرنجا ونە
دڵدارییی بڵێسەی ئاگر
گەرمایی و ڕووناکی پێیە
خۆڵەمێشی سەر هەڵگرتووی
تەریوی سەر پشکۆی باگر
دەیزانمو چاوم لێیە
سووتووی گۆڕستانی کێیە
دووەم دەنگ:
ئەی قەقنەسی وێرانە ماڵ
دەزانی چۆن بەگڕی باڵ
بەگڕی باڵەکانی خۆم
وەکوو مەشخەڵێکی فڕیو
دەسووتێمو دەنیشمەوەو
دەبمە زووخاڵ
دەزانی چۆن لەبەر ژانو داخی نەوی
لەتاوی کزەو ناسۆری
تاوانەکانی سەرزەوی
لەخۆشیی بەرزبوونەوەو



فڕینی بێ گەڕانەوە
بەدەریای وشکی ئاسمانا
جووتە باڵ دەمخاتە مەلە
دڕ بەتاوانەکان ئەدەم
دڕ بەسەرلوتکەکان ئەدەم
دڕ بەباڵدارەکان ئەدەم
دڕ بەتویێی هەورەکان ئەدەم
دڕ بەئەستێرەکان ئەدەم
تا بەئاگری فجووق و فڕینە سەرەو ژوورەکەم
گرێکی دۆزەخ ئاسایی
لە دەروونی خۆم بەر ئەدەم
تالە قەقنەسی سووتاوا
چاو هەڵدەهێنێ بەچکەکەم
سێیەم دەنگ:
کە شەو داهات،
پەروانەیەك لە دوورەوە
رووی کردە هاوسۆزەکانی
بەخۆی و گڕی سوورەوە
وتی: منیش وەکوو ئێوە
لە شەوگاری شەوەزەنگا
لەوەتەی هەم
بەتاریکەی پەژارەو خەم
گڕو ڕووناکی پەرستم
تەنها گڕە خۆشەویستم
من (دێوانە) بم ئەو (شەم)ە
من (خاتوو زین) بم، ئەو (مەم)ە
بۆیە هەر کە تاریکی هات
خۆم ئەسووتێنم کش و مات
بۆیە کە ڕووناکی دەرکەوت
ئەبینی پەروانە دەرکەوت
خۆم بەدەوری سەری ئەوا
زۆر زۆر ئەگێڕم لە شەوا
پەروانەم و خاوەنی ڕێ
دڵدارێکی گڕ گرتووم و
بەبێ ئەوەی لە پاڵ کزەو قرچەکەما
تۆزقاڵێ دەنگم لێوە بێ
دەنگی دوایی:
لایانەوە، بەردە کێلێ
بەم وشانە هاتە زمان:
سەرگروشتەی سەمەندەرو
قەقنەس هەمووی ئەفسانەیە
کەی هونەری جوانەمەرگی و
گڕپەرستی بۆ بێ هەست و
گیانێکی وەك پەروانەیە
ئەو بەهرەیە
بۆ مرۆڤی ڕاکشاوی ئەو خاکەیە
وەك چەخماخەی هەوری ژان گرتووی بارانێ
ڕووناکی خستە ناوەوە
وەك تریفەی مانگەشەوی دەمەو بەهار
شەپۆل، شەپۆل، تیشکی ئاسۆی ئەرخەوانی
پرشنگی ڕشتە گڵێنەی
چاوەکانی چەوساوەوە
چاوەکانی چەوساوەوە

***

## بەستەیەك بۆ هەژاری

شیعری پابلۆ نیرۆدایە

ئەی هەژاری
لەوکاتەوە لە دایك بووم
بەدوامەوەی
لە کلۆری درەختەوە
زستانی ساردو سەختەوە
چاوی زەقت تێبڕیوم
لە کەلەبەرو کونەوە
هەموی شەوێ
تەق تەقی کلیلو کلۆم
ناوەکەی تۆ ئەهێنێ بۆم
لەگەڵ نیشانو رەگەزتا
دیمەنی خوێدانی شکاو
جلو بەرگی کۆنو دڕاو
شڕەی پێڵاو
سڵ کردنی پێ بەخشیوم
هەر لە پارێزی منا بووی
بەکەڵبە تێر نەخۆرەکەت
بەچاوانی برسیتەوە
دەمی خۆڵەمێشیتەوە
جل ئەدڕێنی
دار ئەشکێنی
ئێسقانو خوێن ئەپروێنی
لێرەو لەوێ بەدوامەوە
وەکوو سێبەر
لە کۆڵانو شەقامەوە
لەو کاتەوە لە دایك بووم
لە ژوورە بچکۆلەکەمدا
لە گوزەردا
تۆم ئەدی چیچکەت کردوە
چاوەڕێم بووی
کە پەردەی تەختەی نووستم
لە ئوتێلێکدا لا ئەدا
لە رۆژانی گەنجێتی ما
لە جێی بۆنو بەرامەی گوڵ
فیشکەی دەمی سڕت بوە
ئەی هەژاری!
شوێنم کەوتی
لە سەکەنەو خەستەخانە



لە سەردەمی ئاشتیو شەڕا
هەر کەمن نەخۆش ئەکەوتم
تەق تەق لە دەرگایان ئەدام
بەڵام ئەوەی ئەهاتە لام
پزیشکی دەردەکەم نەبوو
بەڵکوو تۆ بووی ئەی هەژاری
کە ئەهاتیتەوە بۆ لام
شتەکانت فڕێ ئەدام
بۆ چەقی رێگاو بانەکان
کە پیاوەکان
پێیان ئەکرد بەردە باران
تۆشم ئەدی چەن دەستو برد
بەوپەڕی ڕقو قینەوە
لە شتی فەرامۆش کراو
لە چەقی رێو بەر بارانا
تەختێکی ڕزیوت ئەکرد
سەرپەرشتیت ئەکرد ورد ورد
سەرپەرشتی هەژارەکان
ئەمدی کە چۆن دەفری دوایی
ئەکەی بەتاجی پاشایی
ئێستاس ئەمە تا منم من
ئەی هەژاری!
کە پیشەمە شوێن تۆ کەوتن
تۆ دڵڕەق بووی
بۆیە منیش وا دڵڕەقم
ئەمبینی گۆرانی ئەڵێم
لەگەڵ هەموو هەژارێکا
تۆ گۆرانی من ئەبیسی
لەژێر پەردەی گشت تەختێکا
لە خەستەخانەی ستەما
گۆرانییەکەی من ئەبیسی
ئەی هەژاری!
تاکوو مابم
هیچ دەس بەرداری تۆ نابم
لە چوار لاوە ڕاوت ئەکەم
ئابلووقەی مردنت ئەدەم
ئەتکەم بەنیشانی تیرم
ئەتکەم بەدیلو یەخسیرم
نینۆکەکانت ئەشکێنم
کەڵبەت یەك یەك دەرئەهێنم
لەناو دەریای ڕاوکەرانا

له گشت شوێنێ
له قوولأیی کانەکانا
له هەرجێیه
پیاوی لێیه
کەوا ئارەقی ڕەش و شین
لەناو چاوان ئەسڕنەوه
شیعری منەو ئەیلێنەوه
دەستی سپیو دیارین ئێمه
هەموو رۆژێ
لەگەڵ کرێکاری چنین
نان ئەبەخشین
بەگشت نانەواخانەکان
ئەی هەژاری؟
تۆ له کوێ بێ
گۆرانیم بەرز ئەبێتەوه
ژیانی من ئەژێتەوه
خوێنەکەم بەقوڵپی خەبات
ئالأی زەردی تۆ لائەبات
شاعیری کۆنی رابوردوو
تۆی زۆر بەلاوه پیرۆز بوو
نەمر بووی، تۆی لەلا، چاك بوو
دوو کەلی لەلا خۆراك بوو
تاکوو سەردەمیان بەسەرچوو
بەڵام وامن
بەئاگری شیعر وتن
تەختو بەختت ئەسووتێنم
له پاپۆڕێکت ئەخزێنم
منو ئەوانەی وەك منن
زۆر داخ له دڵو دوژمنن
بەدەردێکی ئەوتۆت ئەبەین
وەها شار بەدەرت ئەکەین
لەم ئەرزه جێت نەبێتەوه
فڕێت ئەدەینه مانگەوه
تا لەوێوه
وەك بەندییەکی ساردو سڕ
سەرنج دەی بەچاوێکەوه
بۆ ئەو نانو هێشوانەی
دنیای سبەی ئەگرنەوه

***

## ئەی ئەسپەکەم پەله بکه... پەله

پارچه شیعرێکی (ڕەسوڵ هەمزاتۆف)ه



ڕۆژێ سێ ئافرەت بەرێیان کردم
یەکەمیان پشتیدا بەدیوارەکەوەو
بێ ئەوەی سەر داخا وتی:
ئەگەر تۆ منت له بیر بچێتەوه ناگریم
دوەمیان لەبەر دەرگای ماڵەکه وەستاو
کوننەیەکی پڕی پێ بوو
گوێم لێ بوو وتی:
بگەڕێرەوه بۆ لام، هیچ دوا مەکەوه
سێیەمیان: هەناسەیەکی هەڵکێشاو هیچی
نەوت.
هەر کەله شاخەکه پێچم کردەوه
ئەو شاخەی پارچه هەورێکی ئەرخەوانی دای پۆشیبو
یەکەمم بیرچووەوه
له پێچەکەی ترا، بەدەروونێکی ئاسوودەوه
دوەمیشم بیرچووەوه
فڕیم، سەدان ڕێگام کوتایەوه
لەگەڵ رۆژگارا هاتمو چووم

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی
سىێیەمیانم لە بیر بچێتەوە
کە ماچم کرد بوو
گەڕامەوە بۆ لوتکەکە
یەکەمی نەگریسم دی لەسەر سەربانەکە
چاوەڕێیە
دوەمی ساویلکەش هاتە دەرەوەو
بەکۆنە کوننەکەیەوە
هات بەپیرمەوە
کەچی سىێیەم نەهات بۆ پێشوازیم
لەگەڵ ئەوەشا هەتا دنیا دنیایە
ناتوانم لەبیرم بچێتەوە
شەوانیش هەر خەو بەو سىێیەمەوە ئەبینم
کە ماچم کردوە
وێنە لە شیعری بابلۆنیرۆدا

-1

کۆتایی جەژن
من بابلۆم
تا ئێستا نەگۆڕاوم
خۆشەویستم هەیە، گۆمانیشم پىێیە
قەرزاریشم
لە دەریایەکی فراوانام لەگەڵ فەرمانبەرانا
کە شەپۆل دوای شەپۆل ئەیبزوێنن
لە ئاڵو گۆڕام
سەر لە گەلانی وائەدەم هێشتا لە دایك نەبوون
دێمو ئەچم بەناو دەریاو وڵاتانا
من زمانی دڕك و داڵو
دانی تیژی ژەهرو
لەرزەی ئاوو هەواو
خوێنی ڕێکەوت و
شەوگاری درێژی حووت ئەزانم
چونکە لە زەمینێکەوە
ئەچم بۆ زەمینێکی تر
تاڤگەی چەندان چەمی گەورەو
هەورازی ئەوتۆم بڕیوە
کە یەکجار ستەمە
هەمیشە ئەگەڕامەوە بەبىێ
دڵنیایی و مل کەچی
ئەتوانم چی بڵێم؟!
ئەگەر ڕەگ و ڕیشەکانم نەبونایە

-2

من بۆ گەل ئەنوسم
هەرچەندە بەچاوە ماندوەکانی ناتوانىێ
شیعرەکانم بخوێنێتەوە
بەڵام ئەو کاتە دێت کە دێڕێك
بگاتە گوىێ، گێژەلووکەیەك
بوومەلەرزە بخاتە ژیانمەوە
ئەوسا جوتیاری چاك چاو هەڵ ئەبڕىێ
کرێکار بەزەردەخەنەوە بەرد لەت ئەکات
پاچ وەشێن ناوچەوان بەرز ئەکاتەوە
ماسی گر تۆڕ هەڵ ئەدا بۆ ئەو ماسىیەی
دەستی ئەسوتێنىێ
فیتەر بەبۆنو بەرامەی سابوونەوە لە
شیعرەکانم
وورد ئەبێتەوە
ڕەنگە هەموویان بڵێن:
هاوڕىێی ئێمە بوو
من ئەوەم بەسە
ئەوە ئەو تاجەیە ئارەزووی ئەکەم
لە هەواو
لە مرۆڤی کەرامەت بریندارا
بتوێتەوە

-ئەم پارچە شیعرە لە زیندانە بەسامەکەی (ماکرونیزۆس) شاعیری تێکۆشەری یۆنان (مەتلاوس لاومن) نوسیویەو بەشێوەی نامەیەك بەنهێنی ناردویەتی بۆ یەکێك لە بەندیخانەکانی تورکیا بۆ (نازم حیکمەت) کە ئەو دەمە لە زیندانە تاریکەکەی ئەستەمووڵدا بوە.. لە وەڵامی شیعرێکی کە بەو شێوە نەهێنىیە بۆی ناردوە:-

## هاوڕێم نازم

بیستم دوێنىێ
داخت بۆ یۆنانمان ئەخوارد
دوێنىێ، شەو بوو
کاتێکی تا بڵىێی تاڵ بوو
داخەکەی تۆ
خۆی کێشا بەسەر سنگمانا
ئا ئەو کاتەی کەوا خۆمان
پێچاو بووە زامەکانمان
پەڕۆمان لەسەر لائەبرد
گوێمان ئەگرت
ناڵەی تۆ بوو لە زیندانا
لە زیندانی ئەستەمووڵا

کەوا ئەتدا بەگوێمانا
بەگوێی هەموو
زیندانەکانی جیهانا
ئێستە نازم
من ئەتوانم بەتۆ بڵێم
چەرمی چۆلەکەیەکە جێم
ئێستە نازم
کە چین چین ئارەق ئەڕێژم
ژەنگی پێوەندم ئەچێژم
من ئەتوانم بەتۆ بڵێم
لەم سەر ئاسنی مەچەکەم
هەست بەدەستەکەی تۆ ئەکەم
هەست ئەکەم وای لە گیانما
لە قووڵایی زیندانما
لە ناکاوا
لە کۆتایی عومری شەوا
نامەکەت بۆ ئێرە فڕی
وەك باڵدارێك
لە پڕ لە قەفەز دەرپەڕی
وەکوو دەستێك
لە شەپۆل سەری هەڵ بڕی
بڕگە بڕگە، بەترس و لەرز
خوێندمانەوە
لەبەر تریفەی مانگە شەو
ئەم بوو سوێندی ئەخوارد
بۆ ئەو
کە مۆرەکەی (ماکرونیزوس)
لەسەر کراسەکەت بچنین
ناوەکەی تۆ، وەکوو یەکێك
لە جوانەمەرگانی بڕواو
هاوڕێیانی خۆمان بێنین
ئێمە لێرەدا گیراوین
بێ بن میچ و بەرەڵلایە
پیس و بۆگەن
تاریکییەو دەوری داوە
لە چوار لاوە
ئەوەی کە ئەجووڵێتەوە
بڕ بڕە پشتی وەستاوە
چۆن شیعرەکەت
توانی رێی خۆی بکاتەوە
لە پیاو کوژو
رەشەبای سەخت بەو لاوە
هیچ شتی تر
رێی ناکەوێتە ئەم ناوە
چۆن شیعرەکەت
بۆی کرا مل بنێ واوە
ئەوەی ئەمڕۆ
لە وڵاتەکەم رووی داوە
ئەی هاوڕێکەم
لە هیچ شوێنی ئەم دنیایە
لەوەپێش وا ڕووی نەداوە
نەئەکرێ بیگێڕینەوە
نەئەکرێ بینووسینەوە
تەنیا ئەوەی بەتۆی ئەڵێم:
منداڵەکان
ئەوانەی کە سەدان ساڵە
تەنیا بۆ خۆیان گریاون
کەچی ئەمڕۆ لەناو لانك
ئەگرین بۆ ئازاری باوك
ویستم ئەمە بەتۆ بڵێم
کەچی تەنانەت مۆمەکەم
سەری خەمی لار کردەوەو
دایە پڕمەی گریانی خەست
ئێستا کە شەوێکی خۆشە
سبەی شەبەق ئەبێتەوە
بەیانی زوو، لێرەو لەوێ
خۆر دەرکەوێ
پێوەندمان لە پێ ببێتەوە
بەسواری پاپۆڕی شادی
بەئازادی
دێم هەتاکوو تۆ ببینم
دانامێنم
دەستە سڕ رائەوەشێنم
تۆش دێی بۆ بەخێرهاتنم
ئەوسا بەوێنەی دوو برا
باوەش ئەکەین بەیەکترا
وێڵ ئەبین لەم سەر دنیایە
وەك تازە لە دایك بین وایە
هاوڕێ نازم
ئەگەر دایکەکەی تۆ مابێ
بەماچی دەستی ئەنازم
برات مابێ



داوا ئەکەم
ناوەکەی تۆم پێ ببەخشێ
کوڕت هەبێ
دەستی ئەنێمە ناو دەستی
کچە بچکۆلەمەوە
ئەگەر بێتو کەست نەبێ
هەر کەس
ئەوا منالّە تورکەکان
دایکە بێ دەرەتانەکان
لەسەر تەپۆلکەو گردەکان
لە پشت پەنجەرەی کۆگاکان
لە سەرمانا وشك هەلاّتوون
منو تۆ دوو بەدوو ئەچین
لەگەلّ دایكو منالاّنی
ولاّتی یۆنانی خۆمان
ئەیان بینین
جا پێکەوە
سوێندی رقو قینی نەسرەوت
ئەخۆین: هەرگیز پێنەکەنین
تا هەمووما‌ن پێئەکەنین
گۆرانی ئەلّێین، تا دوایی
بەفرمێسکی جیهان دێنین
ئێستەش ئەی هاوڕێ بم بەخشە
وەردیانەکەم لێ نزیکە
مۆمەکەیشم ئەوا کز کز
لەگەلّ مردنا خەریکە

# یادی (بێکەس)

## 1959




ئەی فریشتەی هەڵبەستی ورد!
مژدەبی با لەتۆو لە کورد
یادی دەساڵەی (بێکەس)ە
ئەو بێکەسەی کوردی کەسە
ئەو بێ کەسەی نەمردووە
لەناو دەروونا زیندووە
ئەژی وەکوو شیعرەکانی
بۆ خزمەتی کوردستانی

***

"بێکەس" لە دەوری ڕابوردو
بەگیانێکی لەخۆ بوردو
بەبڕوای ئاسنینەوە
کەوتە شیعر هۆنینەوە
شیعری چی؟ پشکۆی ئاگرە
دڵۆپی خوێنی شاعیرە
شیعری (بیستو حەوت ساڵە)کەی
کرد بەزمانی حاڵەکەی
ئەو دەمەی وەك بۆمبا تەقی
ڕوبەڕوی جەورو ناحەقی
قسەی دڵی خستە سەرلێو
بێ ئەوەی سڵ بکا لەدێو
ووتی خاکم وێرانەیە
ژێر چەپوکەی بێگانەیە
هوی ئیستیعماری ئینگلیسە
ئەڵێی شەیتانی نەگریسە
وتی: مایەی تۆ درۆیە
هەر بۆ تاڵانو برۆیە
ئەی بەد ڕەوشتو کردەوە
کورد چاوی نووستوی کردەوە
ئەزانێ تۆ داگیرکەری
نایەوێ ژینی نۆکەری

***

بەم چەشنە شیعری گەرمو گوڕ
ڕونو ڕەوان وەك ئاوی خوڕ
سوكو ئاسانو بێ گرێ
بۆ سەر زمان ئەکەوتە ڕێ
شیعری پڕ سۆزو تاسە بوو
داخی دڵو هەناسە بوو
بیروباوەڕو وێنە بوو
بۆ دەرونی ئاوێنە بوو
هەموی هەوێن بوو بۆ خەبات
بۆ ئازاد کردنی وولات
تەڕو پاراو، بەتامو بۆ
بۆ کورد ئەهاتە گفتو گۆ

***

ئەی گیانی بێکەسی نەمر!
ئەی شاعیری مەشخەڵ هەڵگر
ئەی مامۆستای هەڵبەستی جوان
ڕاکشاوی گردی سەیوان
ئەی مشور خۆری قەومی کورد
خۆشەویستی درشتو وورد
هەرچەندە ئاوێتەی گڵی
تا ئەبەد نەخشی سەردڵی
ئەژی لەگەڵ سەرکەوتنا
لەگەڵ جووڵەو نەسرەوتنا
لەگەڵ دڵسۆزیو پاکی‌یا
لەگەڵ تیشکی رووناکی‌یا
یادی تۆ نوێ ئەبێتەوە
هەرگیز لەبیر ئاچێتەوە

# كه شار گڕ ئه‌درێ گڕ ئه‌گرێ

1979

**پێشكه‌شه به‌كاك (هێمن)ی هاوڕێ‌و شاعیر**

كه منالْ بووم
له كاروانێكی شه‌وڕه‌وا
باوكی منیش ڕێبوارێ بوو
بۆ شاره‌كه‌ی بانه ئه‌چوو
به‌پێی به‌لێنێكی كرچی
په‌لپم لێ‌گرت
بم با له‌گه‌لْ ئه‌و كاروانه
بۆ شاره كۆنه‌كه‌ی بانه
***
–نه ء نه ء مه‌یه تۆ منالْی
تۆ خه‌لْفێكی تازه ساوای
شه‌و درێژه‌و ڕێمان سه‌خته
زستان ئه‌تسووتێنێ شه‌خته
برۆ دواوه
سه‌فه‌ری كه‌مان زۆر ماوه
–نه‌خێر، نه‌خێر، ناڕۆمه‌وه
من هه‌ر ئه‌م كاروانه‌م ئه‌وێ
هه‌ر ئه‌م ڕێگا و بانه‌م ئه‌وێ
گه‌شتی ئه‌م زستانه‌م ئه‌وێ
هه‌ر شاره‌كه‌ی بانه‌م ئه‌وێ
***
هه‌ر ڕۆیشتم
پێن نا به‌گلْ‌و به‌ژانا
به‌ئاره‌ق‌و به‌فرمێسك‌و
خوێن‌و كۆسپی ڕێگاو بانا
هه‌ر ڕۆیشتم
له‌گه‌لْ كاروانا گه‌یشتم
ده‌مه‌و ئێواره‌یه‌ك دره‌نگ
خامۆشی‌ی خۆی گه‌یانده زه‌نگ
كه گه‌یشتم
پێیان وتم:
دوا مه‌نزلْه
ئه‌مه شاره‌كه‌ی بانه‌یه
ئه‌و بانه‌یه‌ی
به‌ئه‌سحابه كوژ ناسراوه
ئه‌و بانه‌یه‌ی
كه‌وا چه‌ن جارێ سووتاوه
تا سه‌رله‌نوێ
خۆی، خۆی بنیات بنێته‌وه
بۆ سووتانی كه
هه‌نگاو هه‌لْبگرێته‌وه
تا بۆ دواجار
وه‌كوو دره‌ختێكی پیرۆز
بژێته‌وه‌و
ببڕای ببڕای نه‌مرێته‌وه
***
ئێستاش هه‌رچه‌ن بیره‌وه‌ریم
هه‌رچه‌ن چاوی ئه‌ندێشه‌و بیر
ژان ئه‌كات‌و
ره‌هێلْه‌ی گل ئه‌بارێنێ
ئه‌و كاروانه‌م له‌به‌رچاوه
چۆن به‌ژیله‌مۆی ئازارا
نه‌كوو هه‌ر له‌لایه‌كه‌وه
له‌زۆر لاوه
له‌شی خلْتانی خوێناوه
به‌هه‌ورازی وه‌ك دۆزه‌خا
سه‌ر ئه‌كه‌وێ
ئه‌كه‌وێ‌و هه‌لْ ئه‌ستێته‌وه
ئه‌كه‌وێ ئه‌گه‌ڕێته‌وه
ئه‌كه‌وێ‌و بۆ پێشه‌وه هه‌ر
ئه‌چێته‌وه
بۆ سێبه‌ری ئه‌و دره‌خته‌ی
كه پیرۆزه‌و ئه‌ژێته‌وه
ئه‌ژێته‌وه






# مامۆستا گیان

**بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم لە چوارتا، مامۆستا (ع. و. نوری)**

1971

لەژێر تەمی یادگارا
تەمی خەستی ڕۆژگارا
ئەو سەردەمەی من منالْ بووم
چۆلەکەی بێ‌پەڕو بالْ بووم
بەهەزار حالْ شێوەت ئەکەم
قەتماغەی زامێ لا ئەدەم
هەناسەیەك بەبا ئەدەم
سالأنی پێشووم ڕا ئەدەم
زام: تا بلێی سەختو قوولە
هەناسەی چی؟: گەردەلوولە
کە خوشکی لەش هەلْ قرچاوم
گیانی ئەدا لەبەرچاوم
چۆن دایکی جگەر گڕگرتوم
بۆ فریشتەی لە دەس دەرچووم
خوشکی منو قوتابی تۆ
برژە برژی بوو بەپشکۆ
(کچان)ی[1] لە هەیوان ڕاکشاو
بەئاستەمێ نووزە تیاماو
هاتی بۆلای، مامۆستا گیان
ئەی مامۆستای دلْ میهرەبان
بەدەستو پەنجەی پیرۆزت
بەهەستی بەزەیی و سۆزت
دەرمانت دا لە زامەکەی
بۆت هێنا بڕوانامەکەی
بەچاوی وتی: بۆچیمە؟
هەرچی هیوای ژین بێ نیمە
زۆر دانیشتی بەلایەوە
وەك باوك دلْت دایەوە
ئێستەش یادی ئەو کسپەیە
لە ناخا چەشنی کلْپەیە

**پەراوێز**

[1] ناوی ئایشێ بوو بەلأم لە خۆشەویستیا پێمان ئەووت: کچان.

## سەرنجێك

-1961-

ئەگەر مردوم لە برسانا هەتا ماوم ڕیا ناکەم،
لەڕێی چەوتی ڕیاوە نانو ئاوی خۆم پەیا
ناکەم
ژیانم خۆش ئەویٚ، خۆشتر لەبەر دڵ عیزەنی
نەفسە
هەتا مێشك بڕشتی هۆشو فامی بیٚ،
خەتاناکەم
کە ئەنجامی یەك بستە گۆڕی تەنگو تاریك
بیٚ
لە ڕاستی ڕاستە ڕیٚ دووچاوی تیژم نابینا
ناکەم
ئەبیٚ زادیٚ بخۆم زادەی بەروبوی ڕەنجی
شانم بیٚ
بەگوێرەی خۆم ئەخۆمو کز ئەنیشم ئینتەلا
ناکەم
ئەوەی واتیٚ ئەگا (بۆماڵی دنیا چی ئەکەی
بیکە)
قومارێکەو ئەدۆڕیٚ، بۆیە من یاری وەها
ناکەم
ئەوەی زیاتر تەکانی خۆی ئەدا زوتر ئەبیٚ
ماندو
لە دوی پوشیکی بابردوی بەفیڕۆ چوو هەڕا
ناکەم
ئەوەی ئازاری هەستو گیان ئەدا ئازاری
ویژدانە
ئەگەر باسی سەریشم بیٚ دەروون توشی سزا
ناکەم
حەیاتم گەر هەموی بەختی حەیابیٚ شادو
دڵخۆشم
هەتا هەم بویە هیچ یادی کەسانی بیٚحەیا
ناکەم
ئەبیٚ نەفسم لە دوای عیزەتی نەفسا بناڵێنیٚ
مەگەر بمرم، ئەگینا گورگی گیرۆدە ڕەها
ناکەم
کە ڕێگەی مەردی ڕێگەی پیاوی دڵسۆزی
وەفادارە
بەرامبەر وەعدو پەیمانم ڕەوشتم بیٚ وەفا
ناکەم



## مەردایەتی

1958

زمانم با نەجوڵێنم، کە جولاٚنم قسەی پیٚیە
لە گوللەی خۆت بپارێزە، تفەنگێکەو لەسەرپیٚیە
دەبا تیری قسەی ناخی دەروونی خۆم بهاوێژم
بەریو جیٚی تیٚ ئەگەم، تۆش هەربلیٚ چەند
بیٚسەرو پیٚیە
بەسەربەرزی بژی تا ماوی، مردوو پیاوی سەرشۆڕە
ئەگەرچی نرخەکەی باسی سەرە ژینێکی بەم پیٚیە
مەڵیٚ حەیفە مەرگ جەستەم ئەکاتە خاكو خۆڵی ڕیٚ
سەری سەردارەهای دوینیٚیە وا ئەمڕۆ لەژێر پیٚیە
ئەوی نازانیٚ (ژیری) بیٚ هونەر، تیغێکە بیٚ جەوهەر
لەدو پیٚ زیاترە، هەرچەن بەناهەق ناوی دوپیٚیە
برا پیٚهەڵگرەو توێشوو نەبەردی بابو باپیرە
بەسەر ڕێگەی ژیانا کردەوەی مەردانە جیٚ پیٚیە
سەرنجی پەندی کۆنت بەبرای کوردم کە کون نابیٚ
(کە مردن مردنە ئیتر چیٚیە ئەم لنگە فرتیٚیە)
(کە ئازا جاری ئمریٚ ترسنۆکیش رۆژی دووسەد جار)
لەژینو مردنی مەردی دڵی تۆ بۆچی کرمیٚیە؟
ئەوی شوێنی نەوی شایانی شانی خۆی ئەبینیٚ وا
لە جێگەی گەردی ژێر پیٚیە، سەرانسەر ژینی بیٚجیٚیە
ئەوەش مەرگی لە ڕێگەی ژینی سەربەرزا ڕەوا دیوە
شەهادەت بەن شەهیدی باوەڕی بەرزو بەڕیٚو جیٚیە



# بۆ "گۆران"ی نەمر
## 1964

ئەی باڵداری شیعر ووتن!
جێ بێڵە هێلانەی هەناو
بەرەو ئاسۆی مەبەستی من
شەققەی باڵم ئەویٚ بەتاو
ئەگەرچی پاییزی ڕوو زەرد
گوڵی گۆڕیم بەدڕك و داڵ
گەرچی خەزانی داخ و دەرد
شیرینی لیٚ کردم بەتاڵ
ساردە ڕیٚی دەرو دەشت نیە
گەرمە ناخی هێلانەکەت
دەرچونی تۆ بۆ گەشت نیە
جێ بهێڵە ئاشیانەکەت
بفرەو بڵیٚ: ئەی کوردینە
(گۆران) کۆچی کردە سەیوان
شیعرو ئەدەب پەروەرینە!
گەییە ژێرداری ئەرخەوان
(گۆران)ی شاعیری مەزن
ئەو ئەدیبە هەڵکەوتووە
کەوتە ناو گۆمێکی بیٚ بن
لە باوەش گۆڕا خەوتوە
ئەو بلبلەی بەبەستەوە
تا ئێوارە. تا بەیانی
گۆی شیعری خستە ڕستەوە
بۆ بوکی دڵداری و جوانی

ئەو بوو لە چەرخی بیستەما
شابازی سەر لقی هەڵبەست
لە کێوی سەختی ستەما
قەڵای شیعری تازەی هەڵبەست
شیعری (بەهەشت و یادگار)
چەپکە گوڵی ئەو باخەیە
بۆی جیٚهێشتین بەیادگار
فەرامۆشی ئەم داخەیە
بەچەپکە (فرمێسك و هونەر)
گوڵی پێشکەش ئێمە ئەکرد
سامانی مرواری و گەوهەر
ئەخرایە سەر گەنجینەی کورد
بەنوکی تیژی خامەکەی
لە خەرمانی زمانی کورد
بەرەو نامەو پەیامەکەی
شەن و کەوی وشەی ئەکرد
بۆ ڕووناکی ماندوو ئەبوو
وەك پەروانەی دوور لە چرا
یان پەپوولەی بۆ بۆن تینوو
لە شوێن زانستی ئەگەڕا
لەناو شەوە زەنگی ژینا
وەکوو مۆم سووتا توایەوە
لە دنیای شیعرو نووسینا
سەری سەربەرزی نایەوە

**سەرچاوە**

دیوانی کاکەی فەلاح، چاپی یەکەم- بەغداد 1980-
چاپخانەی الحوادث.



# وشەیەك

مندالّە خۆشەویستەکان!

دەزانن چی وای لیّ کردووم کە ئەمە نزیکەی بیست سالّیّکە، بەشیعر، ئاوڕم لە جیهانە پاك و بیّ گەردو بەفرین و گەرمەکەی ئیّوە داوەتەوەو، کەم و زۆر، توانیومە چەند بەرهەمیّکیان چ لە نامیلکەو چ لە گۆڤارو رۆژنامە کوردیيەکاندا، پیّش کەش بکەم؟...

ڕەنگە هەندیّکتان وا بزانن کە مامۆستای قوتابخانەم و لەم پیشەیە وای لیّکردبم کە ئاشناو تیّکەلاّوی دنیا خۆشەکەی ئیّوەبم... من ئەگەرچی شانازی بە ئەرکی مامۆستایەتییەوە دەکەم، بەلاّم رۆژیّ لە ڕۆژان مامۆستا نەبووم... ئەی باشە رەگ و ریشەی بایەخدانم بەشیعر و ئەدەبی مندالّ چیيە؟ تۆ بلّیّی سادەیی و ئاسانیی ئەم هونەرە شیرینەبیّت؟ نەخیّر ئەوەش نییە، چونکە دانانی بەرهەمی سەرکەوتوو بۆ ئیّوەی ئیّسك سووك، کە بەدلّ و چیّژی ئیّوەبیّت، هەروا شتیّکی ساکارو سەرپێی نییەو بەهرەو هەویّنی تایبەتی خۆی پیّویستە.

ئەوەی ئەم خولیاو کەلّکەلّەیەی خستە سەرمەوە تەنها ئەوەیە کە لە قوولّترین ناخی دلّ و دەروونمەوە سەرچاوەی خۆشەویستییەکی تەواو روون و ئیّجگار گەش هەیە و هەمیشە روو لە پەرەسەندن و زیادییە بەرامبەر ئیّوەی مندالّ و بەچکە مرۆڤ... ئەو دلّپاکی و بیّگەردی و هەست ناسکی و جم و جوولّ و بیّفیّلّی و پیرۆزییەی لە چاوەگەشەکان و دلّە بچکۆلەکانی ئیّوەدا دیومن و دەیانبینم، لەپالّ ئەو نرخ و بایەخەی بەرامبەر بەمرۆڤ لە دلّمایەو بڕوام پیّیەتی، بزوینەری راستەقینەی بەشیّکی زۆر لە هەست و نەستی منن دەربارەی ئیّوەی خۆشەویست...

جا لەبەر ئەوەش کە وەك شاعیریّکی هەست ناسك و منالّ پەروەر و باوکیّکی خاوەن حەوت منالّ، بڕوایەکی تەواو قوولّ و بیّ سنوورم بەوە هەیە کە پیّویستە بایەخیّکی زۆر بەشیعر و چیرۆك و هونەر و هەموو لقەکانی تری ئەدەب و رۆشنبیری منالّ بدریّ، بەنیازی پەروەردەکردن و پیّگەیاندن و فراوان کردنی ئاسۆی بیرو تیّگەیشتن و چیّژ و هەستی ناسکتان.

ئەم کۆمەلّە شیعرەش کە لەژیّر سیّبەری درەختی ئەم دیوانەدا، بە ناوی(جگەر گۆشەکان)ەوە پیّشکەش بە ئیّوەی گلیّنەو جگەر گۆشەی کورد دەکەم بریتییە لە زۆربابەتی پەروەردەیی و کۆمەلاّیەتی و زانیاری و ئەدەبیی ئەوتۆ کە زۆر کەل و قوژبنی جیهانە گەش و رووناکەکەی ئیّوەی گرتۆتەوە، بەپێی ئەو باس و هەناسەو مەبەست و ویّنەو گیانانەی کە لە شیعرەکاندا دەدرەوشیّنەوە... هیوادارم توانیبیّتم ئەوەندەی پیّم کرابیّ نیشانەکان بپیّکم و خزمەتیّکی بچووك و بیّ روالّەت و نیازپاکی جگەر گۆشەکانی کوردم کردبیّ، کە زۆر بیّ بەش و تامەزرۆی ئەم چەشن و بابەتانەن و هەروەهاش لە ڕیّگای ئەمانەوە چەپکیّ شیعرو رەنج و تەقەلاّو بایەخم پیّشکەش بە باخچەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیمان کردبیّت.

**کاکەی فەللاح**

**سلیّمانی- سالّی1977**

## چۆلەکە

چۆلەکەی سەر گویّسوانە
چەن بچکۆلەو چەن جوانە
چەن دلّگیرو ئیّسك سووك
پووش هەلّ ئەگریّ بە دەنووك
بۆ بیّچووی خنجیلانە
هەلّ ئەبەستیّ هیّلاّنە
بۆ بیّچووی زەڕنە قووتە
بیّ پەڕ کەڕووت و قووتە
ئای ئای واچاوم لیّیە
دایکەکە دانی پیّیە
بیچووەکەی بە قونە قون
جووك جوك ئەلّیّ: بەشی من
دەمی بۆ ئەکاتەوە
دایکە دیّ و ئەڕواتەوە
کەهاتەوە ئەیگاتیّ
تیّر تیّر دانی ئەداتیّ
ئای ئای لەو سەیرە خۆشە
دایکە چەن بە پەرۆشە
بیّچووی فیّری فڕین کا
گەشتی ئاسمانی شین کا

***



## مریشکە ڕەشە

مریشکە ڕەشە! کش کش
بۆ کلك و باڵ ئەکەی فش
بۆ شەڕ ئەکەی لەگەڵ من
دایکی جووجەڵەی خڕین
هەر کەتۆ ئەقرتێنی
خۆشی و شادیم بۆ دێنی
دیمەنێکی: سیحراوی
جووچك دەورەیان داوی
جار جارە ڕۆژبێ یاشەو
بۆ حەسانەوەو بۆ خەو
کەتۆ وچانێ ئەگری
هەر دوو باڵت ڕائەگری
جوچکەکان دێنە ژێر باڵ
لە ترسی پشیلەو داڵ
ئەی هۆگری چینەو خۆڵ
پاسەوانی گورج و گۆڵ
منیش دڵسۆزێکی تۆم
ئۆ باڵی تۆ بە ئەستۆم
ئەی مری خۆشەویستم!
لە ڕاستت خاوەن هەستم

***

## دیسان باخچە

باخچەکەمان پڕگوڵە
ڕۆشن کەرەوەی دڵە
لەبەر چاوی من و تۆ
چەن جوانە خونچەو چرۆ
لە باخچەی مندالآنا
لە حەوشەو لەدالآنا
لە ژووری پاك و خۆشا
باخچەی ناوچیمەن پۆشا
لەناو ئینجانەی جوانا
پەروەردەی باخەوانا
باخچەی دڵگیرو ڕەنگین
بەهارێکە: زۆر شیرین
بۆ بەهەشتی منالآن
نەپاییزەو نەزستان
پڕ لە گوڵ و گوڵزارە
هەر چوار وەرزی بەهارە

***

## پەیڕەو

ئەگەرچی لە پۆلی یەکم
قوتابییەکی زیرەکم
وەکو کەروێشك بە قونە قون
ئەچم بۆ قوتابخانە من
لەگەڵ ئەم وئەو شەر ناکەم
بەهاوڕێکانم گەڕ ناکەم
کاتی خۆم بەفیڕۆ نادەم
بۆ وانەکانم ئامادەم
بۆ مامۆستا گوێ ڕایەڵم
بەچاوو گوێ و مێشك و دڵم
ئەرکی ڕۆژانەی وانەکەم
وەك ئاوو دۆ ڕەوان ئەکەم
گوێی وەلآم دانەوەم سوکە
بەڵگەیشم پەنجەی بچوکە
خۆم خاوێنم, بەرگم پاکە
هانینۆکم تەماشاکە
دەستە سڕم لە گیرفانە
ڕۆژ نیە قژ نەکەم شانە
هەر چەن بەرەو ماڵ ئەبمەوە
دوا ناکەوم, زوو ئەچمەوە
دەست و دەم و چاوم ئەشۆم
خۆم ئەگۆڕم, نانم ئەخۆم
سەر خەوێکی بۆ ئەشکێنم
ئینجا ئەرکم بەجێ دێنم
بۆ ئەم پەیڕەوە مل کەچم
تاکو شێرانە دەرئەچم

### سەرچاوە

جگەر گۆشەکان, شیعر بۆ مندالآن, کاکەی فەلاح, بەغداد-1978- چاپی یەکەم

## مێرولەیەک

ڕۆژێکی بەهار دەمەو بەیانی
مێرولەیەکم دی لەسەر کانی
بەتاقی تەنیا لەو قەراخ ئاوە
چنگی لە پارچە نانێ ئالأوە
بۆ ئەوەی بیبا بەرەو شارەکەی
گەرچی گران بو سەنگی بارەکەی
منیش بۆ ئەوەی تاقی کەمەوە
بەردێکم هەڵگرت لەبەردەمەوە
نامە سەر پشتی پارچە نانەکەی
نەیتوانی بیبا بۆ هێلانەکەی
ئینجا نانەکەی بەجێ هێشت، ناچار
ملی ڕێگەی گرت، ڕۆیی بەرەو خوار
ئەوەندەم زانی دە پانزە مێرو
لەسەر ئەو پارچە نانە پەیا بو
لەگەڵ یەکترا زۆر بەئاسانی
نانی ژێر بەردیان خێرا دەرهانی
تومەز مێرولەی یەکەم کە زانی
بەتەنها سەختە ئەرکی سەرشانی
چو هاواری برد بۆ هاوڕێیانی
بێن بۆی لابەرن بەردی سەر نانی
بەم جۆرە ژیریو ڕێی یارمەتیدان
هیوای مێرولەی بەئامانج گەیان

سەرچاوە: چرۆ (1)، هەڵبەست بۆ منداڵان، کاکەی فەللاح.



## ئەی فریشتە!



ئەی فریشتەی خۆشەویستی!
خۆشەویستی پاکو بێگەرد
کەوتومەتە تۆ پەرستی
لە ئاسمان بی یان لەسەر عەرد
خۆشەویستم
ئەتپەرستم
بەتۆ مەستم
بێ تۆ پەستم
پرشنگی چاوە کاڵەکەت
دڵم ڕووناک ئەکاتەوە
بزەی سەر لێوە ئاڵەکەت
گیانم زاخاو ئەداتەوە
ئەی بێ وێنە
خۆت بنوێنە
بێ بم دوینە
بم بزوێنە
بەو چاوە جوانانە قەستەم
بێ تۆ، ژیانم ناخۆشە
ناخی ئەم دەروونە پەستەم
بۆ ڕووناکی تۆ پەرۆشە
پەریزادە
دڵ بەربادە
زۆر ناشادە
خەمی رادە
هەرچەن شێوەی تۆ ئەبینم
لە جوانی تێر نابێ چاوم
بەبێ تۆ شۆخی شیرینم
گوڵێکی سیسو ژاکاوم
بێ ڕەنگو بۆ
بێ هاتو چۆ
بێ گفتوگۆ
دەستەوئەژنۆ
ئەی فریشتە نازدارەکەم!
تۆ چرای، من پەروانەتم
ئەی تاقە وەفادارەکەم!
کووشتەی ئەو تیشکە جوانەتم
هەتا ئەمرم
تۆ پەروەرم
نازت ئەگرم
لەسەر سەرم

### سەرچاوە

لەگەڵ شەپۆلەکاندا، کاکەی فەللاح، بەغداد 1967، چاپخانەی سلیمان الاعظمي.

# ئەدەبی لاوان... یان ڕەسەن

(1)

لەم چەن ساڵی دواییەدا چەن زاراوە و دەربڕینێکی سەیر لە دنیای ئەدەبی کوردیماندا دەرکەوتوە و بەسەردەمی چەن کەس و لە دووتوێی چەن گۆڤار و کتێب و ڕۆژنامەیەکدا خۆی ئەنوێنێ و تەنانەت گەیشتۆتە سەر ئێستگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و تۆڕە ئەدەبیەکانیش. یەکێك لەم دەربڕینانە (ئەدەبی لاوان)ە.. ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە ئەم(ئەدەبی لاو)ە بۆ ئەو مەبەستە بەکار ئەهێنرێت کە ئەدەبی کوردی لەناوەڕاستا بکات بەدووکەرتی تەواوەوە: 1-ئەدەبی پیرەکان 2-ئەدەبی لاوەکان. ئەم جۆرە کەرت کردن و دابەشکردنە نەك هەربنچینەیەکی زانستیانەی ڕاستی نییە. بەڵکوو نیشانەی پاشاگەردانی و سەرلێ شێوانێکی تەواوە.. چونکە ئەوانەی کە ئەم جۆرە پێوانە چەوت و چەوێڵانەمان بۆ دروست ئەکەن ئەیانەوێ ئەوە بەرنە مێشکی خەڵکیەوە کە نەتەوەی کورد خاوەنی مێژوویەکی ئەدەبی ڕەسەن نیەو پێشێلی هەمو ڕابوردوویەکی پڕ لە شانازیمان ئەکەن وای لە قەڵەم ئەدەن کە شیعرەکانی بابە تایەری هەمەدانی و مەلای جزیری و احمدی خانی و حاجی قادر و مەولەوی و پیرەمێرد و گۆران و زۆر لە شاعیرە نەمرەکانی تری کورد بابەتی مۆزەخانەن و ڕۆژیان بەسەرچووە تەنها بەرهەمەکانی خۆیانە کە ئەبێ بە ئاوی زێڕ بنوسرێنەوە و لە چوارچێوەی نرخ و پێزانین بگیرێن و لە ژووریسەرەوە هەڵواسرێن. جابەو بۆنەیەوە بە پێویستی ئەزانم کە ئەم چەند سەرنجەی لای خوارەوە بخەمە بەر چاوی هەمووڵایەك بە نیازی خزمەت کردنی زمان و ئەدەبی کوردی:-

1- ئایا ئەدەب، بە پێی قۆناغی تایبەتی میللەت و قوتابخانە ئەدەبییە ناسراوە چەسپاوەکان و ڕەگ و ڕیشەو کێشەی چینایەتی پێوانە ئەکرێ، یان بە پێوانەی تەمەنی پیری و لاوی؟

2- ئایا ئەدیب و شاعیری ڕاستەقینەی بلیمەت و بەهرەدار تا تەمەنی زۆرتر بێ، سەرمایەی بەسەرهات و تاقی کردنەوە و پێشخواردنەوە و ناڵەی دەرونی بۆ کەرەسەی بەرهەمی پتەو و ڕەسەن زیاتر پەنگ ناخواتەوە؟

3- ئایا مێژووی ئەدەبی کوردی، هەر لە سەرەتاوە تائێستاو لە مەولاش، زنجیرەیەکی نەپساوی جۆش خواردوی هەڵقە هەڵقە نیەو ئەوەی پێی ئەڵێن(کۆن) بناغەی(نوێ) نیەو ئەم لە منداڵدانی ئەوا دروست نەبوەو پێنەگەیشتوە؟

4- کوا ئەو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە وردەی کە بەڵگەی ڕاست و زانستیانە بیسەلمێنێ کە هەموو ئەدەبی ڕابوردوی نەتەوەی کورد کۆن و بێکەڵك و پواوە، تەنها(ئەدەبی لاوەکان) نەبێ کە نوێ خواز و هاوچەرخانەو زیندوەو شایستەی نەك هەر ژیانە بەڵکو بردنە ئاسمانیشە.

5- سەپاندنی حوکمدانی(کۆن) و(نوێ) یان(کۆنە پەرست) و(نوێ پەرست) و(پێشکەوتن) و(دواکەوتن) و(وشك بونەوە) و(تەڕبونەوە) لە ئەدەبا شتێکی هەروا سادە و ساکارە، هەرچی هەڵسێ دەمی تێوەبا؟

6- ئەو شاعیر و ئەدیبانەی ئەمڕۆ خۆیان بە(لاو) ئەزانن و خاوەنی بەرهەم و ئەدەبی لاون، نازانم لەچ ساڵ و مانگێکدا لەلاوی ئەکەون و ئەچنە ڕیزی پیرو کۆچ کردووەکانەوە؟

7- بەبڕوای من ئەدەبی لاو، ئەدەبی تازە پێگەیشتو، ئەدەبی(ناشیء) کە کورد ناشی پێئەڵێت ئەگرێتەوە کە ئەدەبێکی ساواو کاڵ و کرچ زیاتر ئەدات بە دەستتەوە کەڕەوانیە هیچی شاعیر و ئەدیبێکی بەهرەداری کورد شانازی پێوە بکات.

8- تائێستا بەووردی و زانستیانە سەروسیمای پێناسینەوەی ئەم ئەدەبی لاو و نوێ خوازیەمان نەکەوتە بەرچاو کە بەزەقی جیایکاتەوە لە ئەدەبی(پیران و کۆن خوازان).

## قۆناغی پاش گۆران کامەیە؟

(2)

لە بەشی یەکەمدا شتێك لە بارەی(ئەدەبی لاوان یان ڕەسەن)ەوە دواین، وا ئەمجارەش دەربارەی دەربڕینێکی چەوتی تر کە لە باخچەی ئەدەبی کوردیا بە ناڕەوا وەك گیاکەڵە سەری هەڵداوە چەند دێڕێك ئەنوسین؟ ئەو دەربڕینەش(قۆناغی پاش گۆران)ە، ئایا شاعیری نەمری کورد(گۆران) خۆی لە خۆیا قۆناغەو پێش خۆی و دوای خۆیشی بەقۆناغی پێش گۆران و پاش گۆران ئەدرێتە قەڵەم یان نا؟ من وابزانم ئەوەی کەمێك شارەزایی لە پێوانەو ناسینی ئەدەب ببێ هەرگیز بەلای ئەوەدا ناچێ کە قوناغی ئەدەبی و گۆڕین و پێش خستنی بە باڵای تاقەکەس ببڕێ و ئەبێ ئەو ڕاستییەبزانێت کە ئەدەب بە شێوەیەکی زانستیانەی گشتی بەپێی قوتابخانە ئەدەبیەکان دابەش و پێوانە ئەکرێت کە سەرەکییەکانیان.

کلاسیکی و ڕۆمانتیکی و ریالزمیە.

ئایا پایەی ئەدەبی مامۆستا گۆران لەم سێ قۆناغە سەرەکییە ئەدەبییەدا لە کامیاندا دەرکەوتوە؟.. ئاشکرایە سەرەتای بەرهەم و تەقەللای ئەدەبی لەسەر ڕێبازی کلاسیکی، وەك سالم و نالی، دەستی پێکرد، لە دەور و بەری(1930)دا، لە ژێر کارتێ کردنی وورپابونەوەی ئەدەبی تورکی و تازە کردنەوەیا، لەگەڵ مامۆستایان شیخ نوری و شێخ صالح و رەفیق حلیمی، رەشید نجیبدا ڕێڕەوی ئەدەبی ڕۆمانتیکی و تازەکردنەوەی ئەدەبی کوردی گرت و لە شێوە و ناوەڕۆکدا کە سەرەتای ساڵی(1940)یشدا وەك خۆی ئەڵێت، بەزەبری خوێندنەوەی بەرهەمی چەند شاعیرێکی ئینگلیزی سەرەتای ڕێبازی ریالیزمی گرت و لەگەڵ دەورو بەری ساڵی(1950)یشدا ڕوی کردە مەڵبەندی شیعری ریالیزمی سۆشیالیستی، بەم پێیە مامۆستا گۆران لە هەموو قۆناغە ئەدەبی یەکانا بەسەرکەوتویی ڕۆیشتوەو بەرهەمی نایابی بەجێ هێشتوە، تا لە ساڵەکانی دوایی ژیانی یا لەسەر ڕێبازی ریالزمی سۆشیالیستی پێی چەسپاوی داگرتووە و لەنگەری بەمەلی شیعر وتن داگرتووە، ئیتر تێناگەم مەبەست لە قۆناغی(پێش گۆران و پاش گۆران) چییەو ئەو شاعیرە لاوانەی خاوەن بەهرەی ڕاستەقینەن لە شیعرا بۆچی ئەبێ بە نەنگی بزانن کە ئەگەر گیانی بزوتنەوەی تازەکردنەوەی شیعر و ئەدەبی کوردیان تیا بێت، وای نەدەنە قەڵەم کە لەسەر ڕۆیشتن و برەوپێدانی قوتابخانەی ریالیزمی تازەیە کە بەردی بناغەو چەن پایەیەکی بەپەنجەو قەڵەمی بەهرە دار و بەبڕشتی مامۆستا(گۆران)ی نەمر

دانراوە و بەرزکراوەتەوە هەرگیز ناشێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە ئەگەر قۆناغی ئەدەبی بە ناوی تاقە کەسێکەوە ناو بنرێت ئەوا بەلایانی کەمەوە دەیان قۆناغی ئەدەبی توش ئەبین، وەك قۆناغی بابە تایەر و مەلای جزیری و احمدی خانی و حاجی قادر و مەولەوی و شاعیر و ئەدیبە کۆچ کردووە ناودارەکانی تری نەتەوەی کوردمان، لە ئەنجاما لە پاشا گەردانی و سەرلێ شێوانی زیاتر هیچی ترمان بۆ نامێنێتەوە و باسەکەمان تەواو لە ڕێبازی زانستی دورئەکەوێتەوە.

### شاعیرە لاسایی کەرەوەکانمان کێن؟

جار و بار لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، یان لە تەلەفزیۆن و ئێستگەی ڕادیۆ، ئەم دەربڕینە سەیرەشمان ئەکەوێتە بەرچاو و گوێ-شاعیرە لاسایی کەرەوەکان- تەقلیدییەکان- لێرەدا مەبەستی من ئەوەنییە کە شاعیری لاسایی کەرەوە نەبووە ونییە. چونکە شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتنە دواوە ئەتوانین بە لاسایی کەرەوە ناو بەرین لە رووی شێوە و ناوەرۆکەوە. بەلام ئەم دەربڕینە بۆ ئەو جۆرە شاعیرانە بەکارناهێنین، بەڵکو بەنیازێکی تایبەتی بۆ ئەو شاعیرانەی بە کارئەهێنن کە گوایە بە لایانەوە وایە کە لاسایی(گۆران) ئەکەنەوە. ئەوە لە زنجیرەی دووەمی باسەکەماندا تارادەیەك ئەوەمان روون کردەوە کە مامۆستا(گۆران) قۆناغ نییە و قۆناغیش بە ناوی تاقە کەسێکەوە ناو نانرێت، (گۆران) یەکێکە لە هەڵگرانی ئالای قوتابخانەی ریالیزمی و شۆڕشگێری لە شیعری کوردی نیوەی سەدەی دوایی بیستەمدا، جا کە گەیشتینە ئەم راستییە، ئەم پرسیارە سەرهەڵئەدات. ئایا ئەو شاعیرانەی کە هاوچەرخی نەك هاو تەمەنی، گۆرانن، ئەگەر لەسەر پێودانی شیعری ریالیزمی، یان ریالیزمی شۆڕشگێری، رەخنەیی، سۆشیالیستی، شیعری‌یان دانا بەلاسایی کەرەوە ئەدرێنەقەڵەم، یان بەشاعیری ریالیزمی ئەم سەردەمە؟ بەلای ئێمەوە هەرچی‌یەك بێت دوورە لە لاسایی کردنەوە وە، چونکە مۆرکی لاسایی کردنەوە تەنها تەنها بەو شاعیرانەوە ئەنرێت کە چەرخ و سەردەمی ئەدەبی چەشنە بابەتێکی وەك کلاسیکی بەسەرچوو بێت و چەشنە قوتابخانەیەکی ئەدەبی نوێ هاتبێتە پێشەوە بەلام ئەو شاعیرانە نەتوانن دەست بەرداری ئەو کۆتە ببن و ئەم نوێیەشیان پێقووت نەدرێ و هەر لەسەر تان و پۆی شیعری کلاسیکی بەرهەم بهۆننەوە، لەم حاڵەشدا دیارە کاروانی پێشکەوتن و نوێ خوازی ئەدەبی بەجێ یان ئەهێڵێت و ئەکەونە دواوە، ئەگینا قوتابخانەی ئەدەبی ریالیزمی بەواتا رەخنەیی و شۆڕشگێری وسۆشیالیستی‌یەکەی نەك بەواتا ساکارو سادەییەکەی کە لە زۆرکۆنەوە لەبەر باری نالەباری نەتەوەی کورد پێویستی بە بەرز کردنەوەی زیاتر و قوول کردنەوەی گەرمتر هەیە.

تێ ناگەم ئەوانەی کە چەن شاعیرێکی هاوچەرخی(گۆران) بەلاسایی کەرەوە دائەنێن، بۆچی هەرگیز ئاورێك لەو راستی‌یە نادەنەوە کە لە ژێر پەردەی تریقەداری هەڵخەڵەتێنەری نوێ خوازیدا چەن شاعیرێکمان بەوپەڕی گیانی لاسایی کردنەوە و چاو لێ کەرییەوە دەست درێژئەکەن بۆ ناو دیوانی شاعیرە بێگانەکان و دەقاودەقی شیعر، یان چەند بەیتێك، یان ناو نیشانی شیعر، یان بیرو بڕواکەی ئەکەن بە کوردی و بە نرخێکی هەرزان بەم خەڵکەی ئەفرۆشنەوە، ئایا ئەمە لاسایی کردنەوە و چاو لێکەری نییە؟ ئاشکرایە لەمەش زیاترە.

درەختی ئەدەبی ریالیزمی رەخنەیی و شۆڕشگێری و سوشیالیزمی بە هەموو بەش و لق و پۆپەکانییەوە سێبەری لەسەر ئەدەبی کوردیمان راگرتوە... مامۆستایان گۆران لە شیعراو هـ.ن.ب لە چیرۆکدا پەروەردە کەری خەمخۆری رابەرانەی ئەو درەختەن... هەر شاعیر و ئەدیبێکی راستەقینەی نوێ خوازیش لە مەیدانی بەرهەم و تاقیکردنەوەدا، بەپێی بەهرە و لێ هاتنی خۆی، بەشی بەو درەختەوە هەیە و ڕێی داهینانیش لەکەس نەگیراوە.

### چۆن چۆنی لە کۆن و نوێیی شیعر ئەدوێین؟

ئەوە بوو لە زنجیرەی سێیەمی باسەکەمانا کەمێك لە بابەتی(شاعیرە لاسایی کەرەوەکانمان کێن؟) دواین، ئەمجارەش لە چۆنێتی لێدوانی ئەم سەرباسەی لای سەرەوە چەند دێرێك ئەنوسین:-

ئاشکرایە تا دەوروبەری سالانی925-930شیعری کوردی لە روی کێش و یەك قافیەیی و شێوەی دەربڕین و کەرەسەی بیرو ووشەبازی و چاو لێکەرییەوە، بە شێوەیەکی درشت و گشتی، لە چوارچێوەی شیعری کلاسیکیدا توند شەتەك درابوو، بەلام لە سایەی مامۆستایان پیرەمێردو گۆران و شێخ نوری و رەفیق حلمی و ئەورەحمان بەگ و رەشید نەجیبەوە، وردە وردە ئەو سەهۆڵ بەندانی چاولێکەری و لاسایی کردنەوەیە شکاو ڕێگای نوێ کردنەوەی شیعر و موتوربەکردنی بە شێوە و ناوەڕۆکی نوێ گیرایەبەر. ئەم نوێ کردنەوەیەش بەلای کەمەوە لەم چەند خاڵانەی لای خوارەوەدا سەریان هەڵدا:

1- تائەو دەوروبەرە، بەشێوەیەکی گشتی، کێشی شیعری کوردی لەسەر وەزنی عەروزی عەرەبی دائەنرا، بەلام لەوە بەدواوە بەرە بەرە کێشی پەنجە هاتە ناوەوە و کێش روی کردە مەڵبەندی خۆماڵی و نەتەوایەتی و کێشە فۆلکلۆرییەکان بون بە باو.

2- لە قافیەدا یەکێتی قافیە هەتا کۆتایی شیعرەکە لە کۆتا باو بوو، بەلام ئەمان هاتن ئەم رەوشتەیان شکان و ماوەیەکی سەربەست و فراوانیاندا بە خۆیان، واتە خۆیان نەکرد بەدیلی یەکێتی قافیە، بەڵکو هەر بەیتێك قافیەیەکی جیاوازیان پێ رەوادی و قافیەیان کرد بەدیلی بەهرەیان.

3- لە شیعری کلاسیکیدا، شاعیر هەر بەیتێکی بۆ مەبەستێك و بۆ بیرێك ئەهۆنیەوە لە شیعرێکدا واتە(یەکێتی بابەت) لەناوابوو، بەلام لەو سەردەمە بەدواوە ئەم یەکێتی بابەتەکرا بە بنچینەیەك لە بنچینەکانی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی. هەمیشە بە باسمانەوە ئەمرێ، بەلام لەسەر دەستی نوێ کەرەوەکانی شیعرا لە بارستایی خەیاڵ تەواو کەم کرایەوە و خرایە سەرسامانی بیرو پێخستنە سەر زەوی واقیع و بەسەر هاتی راستەقینەی ژیان.

4- وشەبازی لە شیعری کلاسیکیدا شوێنێکی تەواو دیاربوی بۆ خۆی گرتبو، وابەمۆخی وشەدا ئەچونە خوارەوە تەرایی یان لێئەبری. ئەمانە هاتن بایەخیاندا بە شێوەی دەربڕینی نوێ و مانای رون و رەوانی ئەو مەبەست و بیرانەی ئەیانەوێ بیگەیەنن لەسەر پێو دانی(بەشێوە ئاسان و بە مانا گران).

5- نەخشاندنی شیعری کۆن بەوشەی عەرەبی و فارسی و تارادەیەکیش تورکی نیشانەی بەرزی پلەی خوێندەواری و رۆشنبیری شاعیرە کلاسیکیەکانمان بوو، بەلام لەو

سەردەمەوە دەستی بژار کەوتە پاککردنەوەی ئەو جۆرە وشانەو وردە وردە وشەی کوردی پەتی تەنگی پێهەڵچنین و بە تەواوی جێگای گرتنەوە.

6- زۆربەی شیعری کۆن بەدەوری خۆشەویستی دولبەرا ئەخولایەوە بەڵام ئەمان ماوە و مەیدانی شیعریان گەورەترو فراوانتر کرد و پەلی بابەتی جیاواز جیاواز و باسی ڕەنگاورەنگیان بە هەموو لایەکدا گێڕا.

ئەمانە بون بە شێوەیەکی کورت و درشت، جیاوازی نێوان شیعری پێش ئەو سەردەمە و لەو سەردەمەبەدواوە.

بەڵام جاروبار کەلە کۆن و نوێی شیعری کوردی ئەدوێین ئەم ڕاستیانەی لای سەرەوە، بە تایبەتی سەردەمی جیاکردنەوەو ئەو شاعیرە هونەرمەندانەی ناومان بردن، ئەکرێن بە ژێرلێوەوە و وای لەقەڵەم ئەدەن کە هەموو ئەم نیشانەی نوێ کردنەوانەی لای سەرەوە بەرهەمێکی تازەن و ئەمڕۆ پێشکەش بە خوێندەوارانی خۆشەویستی کورد ئەکرێن.

## بایی‌بوون لە ئەدەبا چی ئەگەیەنێ؟

(5)

لەبەشی چوارەمی باسەکەمانا لە(چۆن چۆنی لە کۆن و نوێیی شیعر ئەدوێین) دواین، ئێستا شتێك لە بارەی ئەم دەڕی بایی بونەوە ڕەش ئەکەیتەوە و ئەڵێین: یەکێك نوسراوێکی پڕ لە هەستی بەرز و هەڵسەنگاندن و پێزانین ئەنوسێ بۆ مامۆستایەکی شاعیر دەربارەی بەرزی و جوانی و شێوەی هونەری یەکێك لە شیعرەکانی، ئەویش بەوپەڕی بێ فیزی و لەسەرخۆییەوە وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێت: بڕوا ناکەم شایانی ئەو نوسینەت بم، من ئێستاش خۆم بە شاعیرێکی تەواو نازانم، بەڵکو ڕێگام گرتۆتەبەر کە ببم بەو شاعیرە. ئەم گیانە لە کوێ و ئەو هەوایە لە کوێ کە کەللەی زۆرمانی گێژو وورکردووە؟

ئەگەر بە هێمنی و بێفیزی و گیانێکی بەویژدانەوە دور لە خۆ پەرستی بڕوانینە خۆمان و بەرهەمەکانمان، بەزەقی بۆمان دەرئەکەوێت کە بە شێوەیەکی گشتی نەك هەر تەواو لە خۆمان و بەرهەمەکانمان ڕازین، بگرە خۆشمان بە مامۆستایەکی یەکجار شارەزاو بێ هاوتا ئەو توتی ئەدەینە قەڵەم کە دەمێکە پلەو ئەندازەی بەرزی ئەدەبی شاعیر و ئەدیبە ناسراوەکانمان بەجێهێشتوە. بەڵکەش بۆ ئەم(بوختانە) یەکجار زۆرە بالە خوارەوە بە چەند بەندێك لە کورتی بیبڕینەوە:

1–ئەگەر خوانەخواستە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە یان گۆڤارێك شتێکمان بە ناوی ڕەخنەو لێکۆلینەوە وە لەسەر نوسرا ئیتر هەر خوێنەو کراوەتە جام و هەر دەستەو ئەبڕێ بۆ نەشتەرو پاچ و تەوراس بەڕاستەو چەپەدا هەڵپاچ و داپاچمانە.

2–وردبینەوە ئەبینین لە سەرجیاوازی بیرو ڕاوباری سەرنج و بۆچونی ئەدەبی زۆرکەس لە ناوخۆیانا زیز و دڵگیرن و شەڕەگەڕەکی جاران و فڕکە فڕکی بەردی قۆچەقانی لە دنیای ئەدەبا نەك هەرناو بە ناو دەرئەکەوێت بەڵکو تەواو لەبرەودایە.

3–بەرامبەر ئەم خاڵەش کێمان ویست و لەسەری کردینەوە ئەوا بەسەرومالْ ئێمەش ئامادەین لەسەری بکەینەوە و قوربانی لە پێناوبدەین، بێ ئەوەی گوێ بەینە هیچ ڕەشەباو گێژە لۆکەیەك.

4–ئەگەر خوانارادی و لەلای لابەلاشەوە نوێنەری ڕۆژنامە یان گۆڤارێك دەرکەوت و هەواڵی چەن نوسەرو ئەدیبێکی شارەکەی پرسی ئەوا کاکی وەڵام دەر لە خۆی بەولاوە کەسی تری بەبیرانایەو نایەوێ کەس پاڵەپەستۆی بکات لە چاوپێکەوتنەکانا.

5–تەنانەت ئازایەتی‌و بەخۆدا ڕاپەرموون بە ناوی ئەدەبی نوێوە، گەیشتۆتە پلەیەك خۆمان بە خۆمان بڵێین، دەمێکە سنورو ئەندازەی شاعیرە ناودارەکانمان بەجێ هێشتووە.

6–ئەگەر خۆ گۆشەی شاشەی تەلەفزیۆنێك یان ئێستگەیەکمان بۆ هەڵکەوت ئەوا تاپێمان بکرێ، (باڵی باڵدار و ناڵی ناڵدار) ئەشکێنین.

–ئەم بایی بون و لەیەکتر سوربونەوە و خۆ نواندن و خۆپەرستی و دڵگیری و ڕەواڵەت بازییە بۆ؟ هەمو زانایانی زانستی دەرون لەو باوەڕەدان کە دەردی بایی بون و خۆنواندن و رواڵەت بازی لە یەك سەرچاوەی لێڵی خۆپەرستی‌یەوە هەڵئەقوڵێت و لە بنچینەدا بۆ پڕکردنەوەو داپۆشینی هەست بە ناتەواوی مرۆڤ خۆیەتی لە ناخی دەرونییەوە.

–لە یەکتر سوربونەوە و دڵگیریش، لە ژێر پەردەی ڕەخنەو ڕەخنە کاریا کە بەم شێوە توند و تیژییە سەری هەڵداوە، ئەنجامی باری نالەباری شێواوو لە گریژەنە چووی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری و ئەدەبی و دەرونی ئەم چەند سالانی دوایی‌یەیە، دەوری نوسەر و ڕۆشنبیری ڕاستەقینەی کوردیش ئەو خاوەن بەهرەو قەڵەمە پیرۆز و بە پرشتانەن کە نەك هەر سەر لەم گێژاوو پاشا گەردانییە دەرکەن، بەڵکو پەڵە هەوری ڕەش و چەرەدوکەڵ و تەم و مژی بەسەر یەکا کەوتوی ئەم دەردو ناتەواویانە بڕەوێنینەوە لە پێناوی خزمەت کردن و گەشەپێدانی ئەدەب و زمانە خۆشەویستەکەمانا.

مەبەستی ئەوەنییە کە هەرچی نرخ و بایەخی گیانی هەیە لە بەرچاوی ون بوەو نایبینێ، بەڵکو لەوکاتە ناهەموارە تاریك و نوتەکەدا ئەیەوێ ئەوەمان بە خەستی تێبگەیەنێ کە لافاوی دەردو ناتەواوی و کەم کوری و ستەم و بێدادی تاچ ڕادەیەك پەرەی سەندوەو لە باوایە ئەگینا ئەگەر بە سادەیی وەری بگرین ئەوا(گۆران)ی مەزن خۆشی یەکێکە لە کوردەکانی عێراق یان(پیرەمێرد) کە لە شیعرەکەیا پەنا ئەباتەبەر(سلمانی پاك) و ئەڵێت:

بڵێ: بە قوربان تۆ ناوت پاکە
بمانخەرە ڕێی یەکێتی و چاکە

یان کە ئەڵێت:

دەك خەجاڵەت بن لە ڕوی مەحشەرا
ئێمە خاکی غەم ئەکەین بەسەرا

لە ژێرکارتێ کردنی بیروباوەڕێکی ئایینی دا دەست نیشانی ناکۆکی و ناپاکی میللەت فرۆشانی کورد ئەکات.

پێوانەی ڕاست و دروستی هەموو شاعیرێك تێکراویی بەرهەم و نوسینەکانێتی لەبەر ڕۆشنایی و ڕێبازی ئەو بیرو فەلسەفەو باوەڕەی لەسەری ئەڕوات لەڕوی ناوەڕۆکەوە، لە ڕوی شێوەشەوە سیمای و هونەری‌و شێوازو دەربڕین و بابەتەکانی تری ئەم لایەنانەوە.

# تەصەووف لە شیعری "مەحوی"دا:

**کاکەی فەلاح**

وەك لـە سـەرەتای باسـەکەوە وتمـان، شـاعیر زانایـەکی موتەصـەویف بـوە. تەصـەوف کەلـە بناغـەدا بیروبـاوەڕێکی ئایینیـیـەو ئامانجی شـکاندن‌و کوشـتنی نـەفس‌و ئـارەزوی مـرۆڤو پاکردنـەوەی گیـانی ئـادەمیزادە لـە چڵـك‌و پەڵـەی دنیـا پەرسـتی‌و پولـەکێتی‌و بەوچـاوە سـەیری ژیـان‌و سروشـت ئـەکات کـە (یـەکێتی بـون) هـەمو لایـەکی گرتوەتـەوە وەجیهـانێکی پـڕ لـە خۆشەویسـتی راسـتەقینەو ڕێبازێکی گیانی بەگیانی دوور لە مادە پەرستی بەدەوری خۆیا دروست کردوە کە پڕ بێ لە کەڵکەڵەو خەیاڵی ناسك‌و هەستی پیرۆز کە دڵسۆزی‌و راستگۆیی‌و جگەرسۆزی لێ هەڵ قوڵێت.

بـەم پێیـە، شـاعیر لـە زۆر لای دیوانەکەیـەوە ئـەم بیروبـاوەڕەی تەصـەوفەی دەربڕیـوەو بـێ بایـەخی دنیـای خسـتۆتە بەرچـاوو خۆشەویسـتیەکی بـێ هاوتـای پـەروەردە کـردوە لـە دڵ‌و دەرونـی خۆیـاو هەمیشە لە نەفسی خۆی داوە. بەوێنە:

حەققی ئیخلاصە بەجێهێنانی ئادابی خولوص
پێبزانێ، یانەزانێ، من بەدڵ یادی دەکەم
ئاوی تێغی وەققی هەر توشنەلەبێکە، من نەبم
کاریگەر بێ یانەبێ، لەم مەظلەمە دادێ دەکەم

واتە:

پێویستی سەرشانی دڵسۆزیە کە ڕەوشت‌و ئادابی تـەواو بـەجێبێنم. ئیتر خۆشەویستەکەم پێبزانێ یا نەزانێ من دەربەست نیم. چونکە مـن بـۆ ئـەوەی ناکـەم کـەوا ئـەو پێـی بزانـێ، بـەڵکو تـەنها ئەمـەوێ بـەدڵ یـادێکی بکەم، ئاوی تێغەکـەی تەرخانـە بـۆ هـەموو لێـو وشـك‌و تینویـەك، تـەنها مـن لێی بێبەشم، لەبەرئەوە لەم جەورو سزای بێبەش

ئەم جۆرە هەست‌و نەستە تەنها لە دنیای گیان‌و تەصەوفدا ئەم پلـەی بـەرزی‌و خۆشەویستی‌و بێباکیـە ئـەگرێت کـە شـاعیر دڵسۆزی خـۆی بـەو شـێوەیە دەرئـەبڕێت بـەبێ ئـەوەی چـاوەڕوانی پاداشـی پێزانینـی خۆشەویسـتەکەی بکـات. لەمـەش زیـاتر پێدائـەگرێت‌و هـاوارو سـکاڵای گـەرمی لـە دەسـت ئەوەیـە کـە خۆشەویسـتەکەی لەسـەری هـەزاران عاشـقی داوە، کەچی ئەم لە شەرەفی ئەو کوشتنە بێبەش‌و ڕەنجەرۆ ئەکات.

یان لە شوێنێکی ترا:

لە ئاوی تێغی هەرزامێ بو ئاوا
برینی من نەبێ هەروایە وێران

واتە:

بـەئاوی تێغـی دولبـەر هـەمو برینێـك ئـاوەدان بـوەوە، تـەنها برینـی مـن نەبێ کەلەبەرئەوەی ئەو ئاوەی بەر نەکەوتوە هەر وابەوێرانی ماوەتەوە.

شاعیر لێرەدا ئاوات بۆ ئـەوە ئـەخوازێ کە برینـی وێرانـی دڵـی بـەئاوی تێغی خۆشەویستەکەی ئاوەدان بکاتەوەو لە ڕێگای ئەو خۆشەویستییەدا سەری خۆی دابنێت‌و شەهید بکرێت، وێرانی برین لەلای شاعیر ئەوەیە کە ئەوەنـدە کاریگـەر نیـیـە بیکوژێـت، ئـاوەدان کردنـەوەی برینیش یـەعنی کولاندنەوەو دوبارەکردنەوەی کە ئەبێتە هۆی بـەخت کردنـی ژیـانی شـاعیر لەو ڕێیەدا.

یان:

کە ڕۆحم تێگەیی تۆ حەز لە دەرچونی دەکەی، دەرچوو
دەبێ عاشق کە دێ بێزارە یاری، بێ برۆ بڕوا.

واتە:

گیانم کە بۆی دەرکـەوت تـۆ حـەز بەدەرچـونی ئـەکەی، دەرچـو، چـونکە عاشـق کـەزانی یـار لێـی بێـزارو پەسـتە ئـەبێ بـێ ئـەوەی پێـی بڵـێن بـڕۆ، خۆی لە خۆیەوە بڕوات.

لەروی بێ نرخی دنیاو کوشتنی گیانی تـەماع‌و چاوچنۆکی مرۆڤەوە ئەڵێت:

تاسەر نەبۆتە گۆ، دەلە دنیا دەتۆ شەقێ
هەر ئەو شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ

واتـە: تـا نـەمردویت‌و سـەرت نەبوەتـە تـۆپی پـێ بـۆ شـەق شـەقێنی زەمانە.

تـۆ دنیـا بکـە بـەتۆپ‌و تێـی هەڵـدە، چـونکە هـەر ئـەو شـەقەی تـۆ جـێ ئـەگرێ کـە هەڵـدرێ لـە دنیـا کـە هیچـە. ئـەم جـۆرە تێبینـی‌و فەلسـەفەیە هەرچـەندە بـەگیانێکی تاریـك بینـی (تشـاؤم) ئـاو دراوەو دنیـا لەبەرچـاوی مـرۆڤ ئـەخات‌و بەشـتێکی زۆر هـیچ‌و پوچـی نـاو ئـەبات، بـەڵام بـەپێی بیروباوەڕی تەصەوفی ئایینی شاعیر جۆرە یاخی بون‌و هەڵگەڕانەوەیەکە کە بەرهەڵستی نەفس‌و ئارەزوی چاو برسییانەی مرۆڤ ئەکات،؟ هـەروەها جـۆرە بێـزاری‌و هـاوارێکی گەرمـە بەرامبـەر بـەو دەسـەڵات دارە دنیـا پەرستانەی کەلە پێناوی مەبەست‌و ئارەزوی چاوچنۆکیی خۆیان پف لـە دۆ ناکەن‌و بەهەمو دنیا داناکەون.

بۆیـە لەلایـەکی تـرەوە ئـەم ژیـان‌و دنیایـە بـەم شـێوەیەی لای خـوارەوە ئەداتە قەڵەم‌و ئەڵێت:

لە مانمدا نەدیوە حاصلێ، غەیری تەوەحوش من
خودا پێداو ئەوانەن لەم وحوشستانە زو ڕۆیین

واتە:

بەروبوی مانەوەم تەنها غـەریبی‌و وەحشـەتە، خـودا پێـداویش ئەوانـەن کەلەم وحوشستانە دەرچون‌و مردن.

لێرەدا تۆ بڵێی شاعیر ئەوەندە خۆی بـەدەم هێـزی تاریـك بینیـەوە شل کردبـێ بـەجارێك ژیـان‌و دنیـای لەبەرچـاو کـەوتبێ‌و پـڕ بـە دڵ ئـارەزووی مردن بکات؟. نـە ء بـەڵکو تـەنها ویستویەتی لـەڕێی ئـەم جـۆرە دەربڕینـی بێزاری‌و پەستییەوە نارەزاییەکی بەکوڵ دەربڕێت بەرامبـەر بـەو دەسـەڵات دارانەی کەلەبەر چاوی شاعیر بەجانـەوەر خۆیـان پیشـان داوە ئـەگینا هـەر (مەحوی)یە کە ئەڵێت:

پیرێ نەمامی باغی جوانیمی کردە پوش
تازەم درەختی طولی ئەمەل دەردەکا چرۆ

واتە:

هەرچەندە پایزی پیری بـاخی جـوانیمی زەردکـرد وەکـو پـوش، کەچـی تازە درەختی ئاوات‌و هیوای دورو درێژم چرۆ دەرئەکات.

ئـەم فەلسـەفەیە جـوانترین‌و راسـتترین شـێوەی دەربڕینـی مەبەسـت‌و ئـارەزووی غـەریزەیی مرۆڤـە لـە ژیانـا، کـە هەرچـەندە بـەرەو پـیری‌و مـردن

بڕوات، پتر پاشماوەی دواچۆڕی ژیانی لەلاشیرین ترو خۆشەویستر ئەبێتو لە تافی لاوییا ئەوەندە بەتەنگ ژیانی خۆیەوە نییەو ئەو چاوچنۆکیو ژیان پەرستیەی کەلە دوا ساڵەکانی تەمەنو ژیانا هەیەتی لە گەنجیا زۆر کەمترە، وەك پارەدارێکی نابوت رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر بەتەنگ ئەو قەرزوقۆڵەو پارەکەمەوەیە کە ماویەتی کەچی لە لوتکەی بونو دەوڵەمەندیدا دەربەستی زۆر شت نەبووە.

هەر لە ژێر تەمو مژی ئەو نارەحەتیو بێزاریەی کە شاعیری تیا ژیاوەو لەبەردوکەڵی ئەو ناتەواویو ئەشکەنجەو سزایانەی کە دیویەتی بەدەست دنیا پەرستانی زەمانەو لەژێر زەبری هەست ناسکیو باوەڕی نەفس کوشتنا، پەنای بردوەتە بەر پیش خواردنەوەو خەفەتێکی خەستو خۆڵو ئەڵێت:

بێ منەت ڕزقێکە غەم، بمرم لە برسا ئەو دەخۆم
تەفرە ناخۆمو طەلەب ناکەم لە دنیا قوتی ڕۆح

واتە:

خەمو خەفەت زەخیرەی بێ منەتی خۆمە، ئەگەر لە برسانا خەریك بو بمرم ئەوا خەم ئەخۆم، هەرگیز تەفرە ناخۆمو دەستی داوا بۆ خۆراکی گیان لەم دنیایە پان ناکەمەوە.

ئەم هەڵوێستەی شاعیر ئەوە ئەگەیەنێ کە ژیان ئەوە ناهێنێ لەسەر رێگای (بۆ ئامانج هەمو هۆیەك دروستە) بڕۆین، ئامانجی بەرزو بەپیرۆز ئەبێ بەهۆی پیرۆزەوە بێت، ئەگەر زەخیرەی تر لە رێگای راستو دروستەوە دەستگیر نەبوو ئەوا زەخیرەی بێ منەتی هەڵکردنو خەمو نەفسی بەرزی هەیە تنیاتی پێبکرێو تەفرە کەس تەفرە نەدات.

یان لەلایەکی ترەوە ئەڵێت:

(تاك)ی ڕواوی ئاوی چ مەینەت زەدە بوو
پشکوتوە لەبەزمی مەی ئەمشەو هەر ئینقیباض

واتە:

داری مێوی ئەو شەرابەی کە من لە بەزمی ئەمشەودا ئەیخۆمەوە، ئاخۆ روداوی ئاوی دەستی چ کڵۆڵو ناشادو مەینەت پێکراوێکە وا ئەم هەمو دڵ تەنگیو سەغڵەتەم پێ ئەبەخشێ!؟

شیعرەکانی (مەحوی) بیکرمو پێشکەشی بکەم.

لە ئەنجاما، لەوانەیە بەجێ نەبێ، ئەگەر بڵێم دیوانی (مەحوی) بۆ یەکەمجار لەلایەن شاعیری ناودارو بەڕێز مامۆستا (عەلی کەمال باپیر ئاغا)وە لە ساڵی 1922ز لە چاپخانەی شارەوانی (حکومە) لە سلێمانی چاپ کراو بڵاوکرایەوە، لە ساڵەکانی 1960و 61یشدا بۆ ماوەی چەند مانگێك شاعیری گەورەی کورد مامۆستا گۆرانو مامۆستا شێخ محمدی مەحوی کوڕەزای شاعیری ناوبراوو من خەریکی راست کردنەوەو شیکردنەوەو ڕێکخستنەوەی دیوانەکەی بوین، کەلەم ڕووەوە بەرهەمێکی دیاربوی هەنگاوە سەرکەوتوەکەی بەدەستەوەیە، هەروەها زانای ناسراو مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرسو مامۆستا محمدی مەلا عبدالکریم بۆ ماوەیەکی باش تەواو خۆیان ماندو کردو ڕەنجو تەقەلایەکی پیرۆزیان دا بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوەی شیعرەکانو رێکخستنەوەی دیوانەکەی بەشێوەیەکی تێرو تەسەل کە ئامادەکراوە بۆ چاپ.

## سەرچاوە

شەنو کەو (دەستنووس)، کۆمەڵێك وتاری ڕەخنەییە دەربارەی شیعرو ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردیی، نوسینی کاکەی فەللاح.





# کاکەی فەللاحم چۆن ناسی

لە ساڵی1940دا لە چوارتا سەرنوسەری دادگابوم لەوێ میرزا حەمەئەمینم دی کە مەشهورە بە(بابێ) دوکانێکی بچوکی بەقاڵی هەبو، پیاوێکی زۆر روخۆش و دڵپاک بوو. جاروبار ئەچوم لە دوکانەکە لای دائەنیشتم باسی کاروباری ژیانمان ئەکرد منداڵێکی وریا و زیرەك ئەهاتە دوکانەکە بۆم ئاشکرابوو کە کوڕی میرزا حەمە ئەمینە وە ناوی(محمد)ە وە زۆرجار هەندێ پرسیارم لێ کرد خێرا زیرەکانە وەڵامی ئەدامەوە ئەو کاتە تەمەنی 12ساڵ ئەبوو دیاربوو قوتابیەکی وریاو زیرەکە وەلە خوێندن کەڵکی وەرگرتووە ئەم قوتابییە وریایەم ئەدی وە ئەمدواند بۆم ئاشکرابوو کە دوا ڕۆژێکی زۆر ڕووناك و بەهرەداری هەیە لە دنیای شیعرو ئەدەبدا. لە ساڵی1960 بەدواوە لە سلیمانی چاوم پێئەکەوت وەقسەم لەگەڵدا ئەکرد زانیم کە لە خوێندن وە لە شیعر و ئەدەبدا زۆر بەهرەدارە. وەلەوکاتەدا کە ئیدارەی چاپخانەی(ژین)ی وەرگرتبو ئامشۆم ئەکرد وە لەشیعر و ئەدەبدا وتو وێژمان ئەکرد سەیرم کرد گەیشتۆتە ئەوپەڕی بەهرەداری لە دنیای ئەدەبدا هەندێ جار نوسین و شیعری لە ڕۆژنامەکەیدا بۆ چاپ ئەکردم ئیتر لەو کاتە بەدواوە زۆر دڵبەندم بوم بە هاوڕێیەتی هەتا دوا ڕۆژی ژیانی کە ئەکەوێتە1990/10/9.

نوسخەیەك لە دیوانی شیعرەکانی خۆی پێشکەش کردبوم کە زۆر پێخۆشحاڵ بوم ئەم مرۆڤە زیرەك و وریایە لە دنیای ئەدەب و شیعردا خزمەتێکی بێ پایانی هەبوو وە بەچاکترین شاعیری ئەزانم لەدوای گۆرانەوە.

ئەمەکورتە باسێك لە ژیانی کاکەی فەللاح کەبەداخەوە ئێمەی بەجێ هێشت بەدڵێکی غەمبارییەوە.

بەڕاستی مەرگی کاکەی فەللاح خەسارەتێکی زۆرگەورە بوو لە دنیای ئەدەب و شیعردا. لە یەزدانی گەورە داواکارم کە دواجێگەی ئەم مرۆڤە بە نرخە کۆشکی بەهەشت بێ.

خۆم بە شەرمەزار ئەزانم کە بەم چەند ووشەیە باسێکی کورتی ژیانی کاکەی بەنرخ و بە ڕێزم کرد. علی عارف اغا

ئەمەش شین نامەیەکە لەڕۆژی1990/10/15 بۆ خواڵێ خۆش بوو کاکەی فەللاح دامناوە

## شین نامە بۆ خواڵێ خۆشبوو



### "کاکەی فەللاح"

یەزدانی ئەدەب مات و دڵ تەنگە
فریشتەی شیعر پەست و بێ دەنگە
ئاسمانی هەستی بەرز و زانستی
لێڵ و تاریکە چی یە مەبەستی
خەریکە داکا ڕەهێڵەی خەفەت
تێك بدا کۆشکی هەست و محەبەت
ئەمە بۆچی یە ساچی ڕوویداوە
چ مەردێکی چاك ئاخۆنەماوە
وەڵامی دامێ دڵی بریندار
ووتی نازانی چەرخی ڕۆژگار
کاکەی فەللاحی کۆچ پێ کردووە
یانەی ئەدەبی گشت ڕوخاندووە
نکتەی شیرین و شیعر و بیری جوان
لەگەڵ کاکەدا چونە گۆڕستان
هەرچەندە زۆرە ساڵانی ژینم
وێنەی ئەم زاتەکەسێ نابینم
هەستیارێ بوو بە نرخ و باڵا
شایانی ڕێزبوو لە هەموو حاڵا
کردارو پیشە و ڕەوشتیچاك بوو
لەگەڵ ناحەزیش زوبانی پاکبوو
یاریدە دەربوو بۆڵی قەوماوان
لە گشت ژیانیا دووربوو لە تاوان
بۆ هەموو کەسێك سایەی ئومێدبوو
داخەکەم وازوو لە دنیادەرچوو
جێگەی گوم نی‌یە سوپاس بۆ یەزدان
چاك و بەنرخن وەك خۆی کوڕەکان
ئەوانیش هەموو خاوەن شعورن
لە کاروپیشەی خراپە دوورن
جێگەی ئەو باوکە باشە ون ناکەن
خەریکی پیشەو کردەوەی چاکەن
ناوت زیندووە هەتا قیامەت
سالە گۆڕت بێ سەدهەزار ڕەحمەت
علی عارف اغا

"شادی" 1992/10/21

# سەدای سەردەم و چارەکە سەدەیەك

**بۆ یادی مامۆستای بەڕێزم(کاکەی فەللاح) پێشکەشە**

**نووسینی/محەمەد کەساس**

کوانوی شەوانی بێ ئاگری ئەم گەلە زەحمەتکێش و ستەم دیدەیە، لەوەتەی دونیا دونیایەو ژیان بەردەوامی وەرگرتووە و یاسای دژەکان و مانەوە سەری هەڵداوە، ئەم کوانووە پێویستی بەکەڵە پیاوان و قارەمان و نیشتمان پەروەر و لە خۆبووردوو ڕۆشنبیر و شاعیر و ئەدیب و نووسەرهەبووە و دەبێت بۆ ئەوەی ببنە کەڵە پشکۆی و خەڵکی ڕەش و ڕوت و چەوساوە و ئازار چەشتوو و مناڵە دەست و پل قڵیشاوەکان لەبەریدا گەرمەی بگاتە گیان و جەستەو بیریان و تروسکەی سەرفرازی و ئازادی و ڕزگاربوون لەدەم کەلی پڕلە هیواو ئاواتی سەوزی هەمیشەییدا بە چاوی خۆیان ببینن و بیکەنە مەشخەڵی ئازادییەکی بەرفراوانتر و بەرینتر بۆ بەدەست هێنانی کۆمەڵگای بێ چەوسانەوە.

کەڵە پیاوانی مەیدانی کوردایەتی هەر لە شێخی نەهری و شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحموودی نەمرو بارزانی و خاڵە شەهاب و کاك ئارام و دەیانی تر، بوونە سووتەمە ڕۆی ئەم کوانوە، لە مەیدانی بەرگریی لە شەرەف و مافی زەوتکراوی کوردا.

لەزۆر لە مەیدانەکانی تریشدا گەلێ نموونەی قارەمانمان هەن و لەسەرروویانەوە مەیدانی ئەدەب و ڕۆشنبیری و مێژوو کەلتوورو زمانی کوردیدا، دەیان کەڵەپشکۆی ئەم کوانوە ناویان بەنەمریی و ئاوی زێڕ لەسەر لاپەڕەی گەشی مێژوودا تۆمارکراون، هەر لە گۆران و ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی و ئەحمەد موختار جاف و بێ کەس و پیرەمێردەوە تاکو(کاکەی فەللاح).

ئەم قارەمانەی مەیدانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی، سەربازێکی نەترس و ڕاستگۆ و لە خۆبووردوو لەسەرخۆو هێمن و ڕۆشنبیربووە، گەر بیویستایە لە سنووری وولاتی هەربابەتێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بچێتە ژوورەوە، بێشك بەبێ پەساپۆرت سنووری دەبەزاند و سوارچاکێکی چالاك و شارەزاو(خۆش دوو)بوو.

ئەم مامۆستا ڕۆشنبیرە، یەکێك بووە لەو ئەدیب وڕۆشنبیرو شاعیرە بەتوانایانەی کە هەمیشە پشت و پەنای شاعیرو نووسەرە لاوەکان بوون و ڕێ نیشاندەریان بوون و هانیان داون.

خۆم یەکێکم لەوانەی کە لە ساڵی(1975)ەوە دەنووسم و لە ساڵی(1978)دا یەکەم بەرهەمی شیعریم بڵاوکردوەتەوە، سەرەتای یەکترناسینمان لەگەڵ ئەم کەڵە پیاوەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(1978). ئەو کاتانە بە خزمەتی دەگەیشتم و نوسراوەکانی خۆم پیشان دەدا و ئەویش ئەگەر تێبینیی هەبوایە بۆی دەنووسیم و پاشان پێی دەگوتم(تۆ کانیەکی بە هارەی شیعری بەرگریت) بەڵام وورپای خۆتبە، چەن ساڵێك بەوشێوەیە، پاشان لە سەرەتای ساڵەکانی هەشتادا کە(چاپخانە جوانەمەرگەکەی) دامەزراندەوە، ئەوجا بەگەرمەی پەیوەندیمان پتەوتربوو، زۆر ئێواران لە خزمەتیان لە چاپخانەکەدا دادەنیشتم، زۆرجارانیش هەرلەوێ بە خزمەتی مامۆستایان(علی عارف ئاغا- دیلانی شاعیر- عبدالقادری دەباغی- کەمال نوری مەعروف- جمال شارباژێری-ع.ع. شەونم و جەزا علی ئەمین) دەگەیشتم و منیش وەکو قوتابیەك گوێم بۆ ڕادەدێران و شتیان لێوە فێردەبووم و ئەگەر ڕووی دەمیشیان بکردایەتە من ئەوا تێهەڵکێشیی باسەکەیان دەبووم، کە چەندین باس و خواسی جۆرا و جۆر، هەر لە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی و مێژوویی‌یەوە تاکو هەندێك جاریش ڕامیاری. ساڵ ساڵی(1983)بوو، ئەو کاتە تازە لە شاخ هاتبومەوە نێوشار، شیعرێکم بۆ(شەهید ئارامی هەمیشەزیندوو) نووسیبوو کەببووە ویردی سەرزمانی زۆربەی(پ.م)ەکانی ئەوکاتەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، چوومە خزمەتی و ووتم مامۆستا:- ئەم شیعرەم لە شاخ نووسیوە بزانم چۆنەبەلاتەوە، کە خوێندیەوە، پاشی تێڕامانێك دیسانەوە فەرمووی: من نەم ووت(تۆ کانیەکی بەهارەی شیعری بەرگریت)، بەدیم کرد زۆر کاری تێکردبوو، پاشی دەڕۆژێك پۆستەرێکی(شەهید ئارام) لە ناوشاردا بڵاوکرایەوە و بەشێك لەوشیعرەی بەندەی لە ژێردا نوسرابوو کە دەڵێت:

ئارام، ناوت نارنجۆکەو لەسەر پێیە
لە ناو دەمی بۆرژوادا
گڕ و کڵپەوتینی پێیە....!!

لەسەر ڕەوتی خۆم، هەمو ئێوارانێك دەچوومە خزمەتی، پاش ئەو پۆستەرە: فەرمووی(شتێکی واکراوە وورپای خۆت بە).

لە ساڵی(1984)دا کاتێك نامیلکەی(کەوی کوێستان) کە شیعری منداڵان بوو لە چاپخانەکەی ئەودا بە چاپم گەیاند، هەموو جارێك دەیفەرموو(گەر بەعس مۆڵەتت بدات قەڵەمێکی بەبڕشتیت).

لە ساڵی(1988)دا ویستم دیوانێکی شیعری بەرگری بە چاپ بگەیەنم، مامۆستا(کاکەی فەللاح) یەکەم کەسبوو بوە هاندەرم بۆ ئەوکارە و پێشەکیەکەیشی بۆ نووسیم و فەرموویشی هەر خۆشم بۆت چاپ دەکەم، بەڵام ئەو دەمانە هەندێك کۆسپ هاتنەڕێمان و ئەو کارەمان بە ئەنجام نەگەیشت، منیش وەکو(وەفا) بۆ ئەو خۆشەویستی یە گەورەیەی کە هەیبوو بەرامبەر من بەرامبەر بە(شیعر)، ئەودیوانە شیعرییەم خستە ژێر چاپەوە بەپێشەکیەکەی مامۆستایشەوە لە ساڵی پاردا واتە ساڵی ڕاپەڕین بە ناوی دیوانی(هەوێن)ەوە.

لەدوا وتەمدا نەمری و سەربەرزی بۆ مامۆستای ووشەی پیرۆزی کوردی و سەرجەم ڕابەرانی کاروانە پڕسەروەرییەکەی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی.

نەمری بۆ شەهیدانی ڕێگەی سەرفرازی و ئازادی وشەی پیرۆزو نەبەردی کوردی. پیرۆزبێت یادی ساڵڕۆژی مامۆستای نەمر(کاکەی فەللاح)ی زیندوو.

1992/12/16

# ئەندێشەی منداڵ و پێکهاتەی گەورە، لەشیعرەکانی کاکەی فەلاحدا

ئاوات محەمەد

ئەدەبی منداڵان لەلای ئێمە مێژوویەکی دێرینی نییە، بەتایبەتی لەو کاتەی دەبێتە خاوەنی دامەزراوەی تایبەت بەخۆی، ئەوەی جێگەی سەرنجە، لای ئێمە هێشتا وەك پێویست گرنگی بەم لایەنە نەدراوە، هەرئەمەشە وادەکات دیاردەی خوێندنەوە لەناو گەورەکاندا لاواز بێت، کەبەپێی شیکردنەوە دەروونیەکان منداڵ هەر لەسەرەتای گەشەسەندنی لایەنی ئەقڵانییەوە، دەکەوێتە بەردەم ئەو بەرپرسیاریەتەی چۆن خۆی لەناو دنیایەك پێکهاتەی ئەندێشەیی و داهێناندا بدۆزێتەوە، کەبنەمایەك بۆ چێژ وەرگرتن لەخوێندنەوەی بۆ دروست بێت، ئەمە ئەرکی یەکەمی ئێمەیە لەگەڵ نەوەی نوێدا بۆ ئاشناکردنی منداڵ بەدنیایەك دەتوانێت زۆرێك لەخەیاڵەکانی خۆی تێدا بەرچەستە بکات، ئێمە کاتی خۆی کەشیعری منالانی شاعیرانی خۆمان دەخوێندەوە، نەمادەتوانی چێژ لەو هەموو پێکهاتانە وەربگرین، کەلەناو ئەو شیعرەدا بەرجەستە ببوو، ئێمەی منداڵ کوژروای دەستی یەك شێوازی کۆنی خوێندنەوە ببووین، ئەویش لەبەرکردنی هەموو دێڕەکانی ناو پرۆسەی خوێندنە، لەبەرکردن ناچاری دەکرین، بۆ کاتێکی کەم، بۆ ئەو کاتەی مامۆستا لێمان ڕازی بێت، شیعرو هەموو وانەکانی تر لەبەر بکەین، ئەمەیە گرفتی نەخوێندنەوە لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا، نەناسینەوەی ئەو شاعیرانەی چەندەها شیعریمان لەبەرکردووەو نەمانزانییوە شاعیرەکەی کێیە، ئێمە ترسێك گۆشی دەکردین، ئەویش ترسی مامۆستایە، ترسانە لەوەی وانەیەك ئەزبەر نەکەین و چەند دارێك یان زللە یان گوێ ڕاکێشانمان ببێتە نسیب.

لێرەوە دێمە سەر شاعیری منداڵان، ئەو پیاوەی زۆربەی تەمەنی بۆ منداڵ تەرخان کرد، کاکەی فەلاح، کەتەنها وشەیکردبووە ماڵی خۆی، ئەوەی لەم مەسەلەیەدا سەرسامم دەکات دووبارە خوێندنەوەی ئەو شیعرانەیەتی، کەبەمنداڵی نەیانهێشت چێژی لێوەربگرم، ئەو گۆرانیانەی هەموومان دەمانووتەوە، بەڵام لێی تێنەدەگەیشتین، لێرەدا کوشتنی تواناکانی ئێمە خۆی حەشار داوە، ئەویش نەبوونی خەیاڵە لەلای منداڵ، کەئێمە دەزانین ئازادی پایەی ئەندێشەیە، ئێمەش ئازادییەکانمان تادوا ئەندازە بچوککرابووەوە، لەبەرئەوە ئەندێشەی ئێمە لەهەموو ئەو شتانە تێپەڕی نەدەکرد، کەلەدەوروبەرمان هەبوو، هەر ئەم هەستە وایلێدەکردین، چێژ لەو شیعرانە وەرنەگرین، کەپڕبوون لەئەندێشە بۆ دنیایەك لەئێمەوە دوورە، ئێمە لێرەدا تەنها باس لەشیعر دەکەین، ئەگەر بێینە سەر ئەندێشەی منداڵی ئێمە بۆ چیرۆك، ئەوا لەکارەسات نزیك دەبینەوە، لەبەرئەوەی هێشتا چیرۆك یەکێك نییە لەبابەتەکانی خوێندن، هەروەها کەمی چیرۆك وای کردووە، منداڵ کۆمەڵێك دنیا هەیە نەیناسێت و پێی ئاشنا نەبێت.

ئێمە کاتێك باس لەئەدبی منداڵ دەکین ئەبێت ئەوەمان بیرنەچێت، کەدوو شێوازی ئەدەبی منداڵمان هەیە، یەکەمیان ئەوەیە منداڵ بۆخۆی دەینووسێت، دووەمیان ئەوەیە گەورە بۆ منداڵانی دەنووسێت، ئێمە لەم باسەدا لەبەرهەمی شاعیرێکی گەورە، کەبۆ منداڵ دەنووسێت هەڵوێستە دەکەین، کەگەورە لەرووی داهێنانەوە خاوەنی جیهانبینی خۆیەتی، یەکێك لەو تەکنیکانەی گەورە لەداهێناندا بەتەواوەتی بەکاری دەهێنێت، زمانە، کەگەورە باشتر دەتوانێت گوزارشتی لەشتەکان پێبکات، ئەویش لەبەرئەوەی زمان ئەو تیانە ڕەمزییەیە بۆ بیرکردنەوەی داهێنەرانە، هۆکارێکە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بیرکردنەوەیە، لەشێوەی ئەدەبێکی هەستپێکراودا دەردەکەوێت، ئەم تەکنیکە بۆ منداڵ بەتایبەتی منداڵی لای ئێمە گەلێك ئاڵۆزە، لەبەر ئەوەیە ئەدەبی منداڵان تاهەنووکە لای ئێمە تەنها گەورەکان دەینووسن، کەزۆرجار ئەو نەبوونی ئازادییەی ئەندێشە، کەلەسەرەتاوە باسمانکرد، وادەکات ئەندێشەی گەورەکانیش ئەو بەرفراوانییە لەتێڕامان و فەنتازیا بەخۆیەوە نەبینێت، بەڵام ئەوەی لەئەدەبی کاکەی فەلاحدا دەردەکەوێت، لەزۆر لەهۆنراوەکاندا لەراستەوخۆی دوور کەوتووەتەوە، یان هەندێك جار تەنها وەسفیکردووە، یان وێنای بارێکی دیاریکراوی کردووە، کەلەنمونە شیعریەکاندا باس لەو حاڵەتانە دەکەین، ئەو نەیویستووە ئەو پێکهاتانە بەرجەستە بکات لەواقعدا بوونیان هەیە، ئاشکرایە هەرچەندە بیرکردنەوە بەرەو واقع بچێت ئەوەندە وێنا کەم دەبێتەوە، ئێمەش بۆ ئەوەی لەرەهەندی وێناکان بگەین، بەرەو ئەو شیکردنەوەیە دەچین، کەوێناو ئەندێشە لەتێڕمان نزیك دەکاتەوە، بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو ئاستەنگی شیکردنەوەی ئەدەبەوە بەگشتی، ئەبێت ئەم جۆرە لەئەدەب لەهەموو جۆرەکانی تری جیا بکەینەوە، ئەدەبی منداڵان خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی، ناکرێت هەموو ئەو تیۆرانەی بۆ ئەدەب هەن، بەسەر ئەمیشدا جێبەجێی بکەین.

بائێستا بچینە سەر شیعر لای کاکەی فەلاح، سەرەتا باتەماشای دیوانی جگەرگۆشەکان بکەین، کەپڕیەتی لەو هۆنراوانەی هەریەکەمان کۆمەڵێك یادەوەری لەگەڵدا هەیە، ئەوەی لەم شیعرانەدا بەرچاومان دەکەوێت، ئەویە کەمترین هەڵاواردنی لەنێوان منداڵەکاندا دروست کردووە، وەك هەندێکجار لەشیعری منداڵانی کوردیدا بەرچاومان دەکەوێت، منداڵ وەك تەمەڵ و هارو هاج و پیس و پۆخڵ ناودێر دەکەن، ئەویش بەپێی ئەو بیرکردنەوەیەی گوایە ئەم

سیفەتانە بەمندالْ دەناسێنێت، کەچەندە زیانمەندە، بەلاَم ئەوەی بیرچووە، زۆرجار ئەو شیعرانە بۆ گاڵتەپێکردن بەمندالْی تر بەکار دەهێنرێت، ئەوەی لای کاکەی فەلاح بەدی دەکرێت، دوورکەوتنەوەیە لەم حاڵەتە، بەڵکو هانی ئەوانەش دەدا، کەلەخوێندن دوا کەوتوون، فریای خۆیان بکەون، ئەم رستەیە، لەبواری پەروەردەدا، کەدووبارە کردنەوە هۆکارێکە بۆ چەسپاندنی بنەماکانی ژیانی رۆژانە، هەروەها لەرووی سایکۆلۆژییەوە کردەی دووبارە کردنەوە دەبێتە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵێك بنەمای دامەزراو لەناخی کارەکتەری کارلێکراودا، لێرەشدا کاکەی فەلاح بۆ ئەوەی مندالْ لەر. ێگەی وتنەوەی ئ‌وەم رستانەوە، دەگەنە ئەو خاڵەی هەموومان دەتوانین سەرکەوتوو بین لەژیانیاندا، بەشێوەیك ئەم هەستە دوەگوازرێتەوە بۆ سەرجەم کایەکانی ژیانی، کەمەرج نییە مرۆڤ لەهەموو هەنگاوەکانیدا هەر سەرکەوتوو بێت، بەڵکو ئەوە ئەزموونەکانە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات لەکوێداو لەچیدا سەرکەوتووین، ئەگەرچی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا شتێك نییە بەناوی شکست، ئەوەندەی قسە لەسەر توان دەکرێت، لەهۆنراوەی لەسەرەتای ساڵەوە، کەهەموومان بەگەورەو بچوکەوە، ئەم هۆنراوەیەمان بەشێوەی خوێندنەوەو سروودیش وتووەتەوە، شاعیر دەڵێت:

دەرنەچوی لەکاروان جێماو
دڵی پڕ خەفەتەو زوخاو
سەد بەڵێنی بەخۆی داوە
ئیتر نەکەوێتە دواوە...

ئەمە بۆ خۆی رێزگرتنە لەو قوتابیانەی کەسستمی پەروەردەی ئێمە بەشێوەیەکی تەواو ستەمکارانە، سزای مانەوەیان دەدەن، ئەوەی ئاشکرا زانستی دەروونی مندالْی نویْ پێی وایە هیچ مندالْك تەمەڵ نییەو توانای فێر بوونی هەیە، بەلاَم لەقەبارەی تواناکاندا جیاوازیان هەیە، دەکرێت دەرفەت بۆ ئەو مندالْش برەخسێت فێر ببێت، کاکەی فەلاح لێرەدا ئاماژە بەوە دەدات، ئەو مندالْە تەنها لەیەك ئەزموونـدا سەرکەووتوو نەبووە، کەدەبێتە چ بارێکی دەروونی ناخۆش لای مندالْ، بەلاَم دواتر ئەو هەستەی لادروست دەکات چۆن هەوڵیبدات ئەم دواکەوتنە دووبارە نەکاتەوە.

یەکێك لەخاڵە جوانەکانی ناو شیعری کاکەی فەلاح بریتییە لەدوور کەوتنەوە لەئامۆژگاری راستەوخۆ، بەڵکو ئەو لەڕێگەی وێناکردنی جوانی مندالْەوە ئەو وێنەیە ببخەشێتە مندالْ، کەچ بوونەوەرێکەو خاوەنی چ جوانییەو بەرائەتێکە، ئەم بەرائەتە ئەوەندە جوانە ئەگەر وەك خۆیان بمێننەوە، گەورەکان دەستی تێوەرنەدەن و بەو هەموو ئامۆژگاریانەی کەمندالْ دەکەنە بوونەوەرێکی گەورە دنیای بچوکیان لێتێك نەدەن، ئەمە سەرەتای دۆزینەوەی بوونیادێکە بۆ ئەوەی مندالْ خاوەنی پێکهاتەکانی خۆی بێت، دوور بێت لەو کەلتوورە کەڵەکە بووەی ناخی گەورەکان، ئەمە وادەکات لەزمانی شیعری و تەنانەت مەسەلەکانی رۆژانەش لەوەی گەورەکان جیاوازتر بێت هەر لەبەر ئەم خاڵەیە دەڵێن نووسین بۆ مندالْ زۆر لەنوسین بۆ گەورە قورسترە، دیارە ئەو ئەندێشەو فەنتازیایەی ئەدەبی مندالاَن پێویستیەتی بۆ گەورە جیاوازترە، ئەو دوو دێڕە شیعرە بۆ خۆی کارکردنە لەسەر راگرتنی هاوسەنگی دەروونی منالاَن، هەروەها تێگەیاندنی مندالاَنە بەوەی چۆن تەماشای یەکتری بکەن و هیچ جۆرە هەلاَواردێك لەژیانی رۆژانەیاندا بەکانەهێنن، بەکارهێنانی زمانی شیعری لەلای ئەم شاعیرە هێندەی نزیك کەوتنەوەیە لەجیهانی مندالْ هێندە ئاراستەکردن نییە بۆ ئەوەی مندالْ چیبکات، ئەوەندەی هەوڵدەدات لەڕێگای وێناکردنی جوانانەی مندالْەوە دنیا وێنا بکات، ئەم کارە بۆ ئەوەیە تاهەمووان لەناو ژیانێکی ئاسوودەدا بژین و جۆرێك لەهێمنی بەدەستبخەن، لێرەوە مەسەلەی دۆزینەوەی ماناکان بۆ مندالْ دەبنە هۆکاری سەرەکی بۆ ئەفراندنی شیعرێك دوور لەهەموو ئامۆژگارییەك، کەمندالْ وەك بوونەوەرێکی بێئاگا لەهەموو شتەکان وێنا بکات.

زۆرێك لەو شیعرانەی کە جۆرێك لەئامۆژگاری تێدایە، راستەوخۆ بەزمانی فەرمانکردن دەربڕینابڕێت، بەڵکو ناڕاستەوخۆ والەخوێنەری بچوك دەکات هەست بکات کارەکەی هەندێك هەڵەی تێدایە، وەك لەشیعری عەبە خەوخۆشدا بەرچاو دەکەوێت، یان لەهۆنراوەی(چەند خۆشە)دا بەرچاومان دەکەوێت، چۆن وادەکات مندالْ ناڕاستەوخۆ لەوە بگات لەگەڵ هەندێك لەکارەکانی ئەویەتی، لێرەدا شاعیر سیفەتی مامۆستا لەخۆی دادەماڵێت و دێت وەك رێکخەر یان چاودێر یان وەك ئەوەی کەسێك بێت هەندێك زانیاری هەیە، لەوانەیە بۆ مندالْەکان بەسوود بێت، دەریدەبڕێت، ئەمەیە ئەو جۆرە هۆنراوەیەی کەبۆ مندالْ جێگەی سەرنجە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەشیعری گدی گدیدا، شاعیر وەك جۆرێك لەخۆشەویستی بۆ ئاژەڵ و ئەو ژیانە هاوبەشەی لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە، جۆرێك لەخۆشەویستی سەیرمان بۆ باس دەکات، ئەوەتا مندأەکە ئەوەندە کارەکەی خۆش دەوێت

هەر کەهاتمە دەر لەژوور
بۆم بباعێنە لەدوور
منیش بۆت ئەباعێنم
وەك تۆ قۆچ ئەوەشێنم
بۆنم کە بەمشەمش
بەرگم تەڕ ئەبێ چش

لێرەدا دوو خاڵی گرنگ هەیە بۆ هەڵوێستە لەسەر کردن، یەکەمیان ئەوەیە لەناو کۆمەڵی ئێمەدا، لاساییکردنەوەی ئاژەڵ کارێکی ئاسان نییە، لەبەرئەوەی لای ئێمە مرۆڤ هەرگیز ناچێتە قاڵبی ئاژەڵەوە، بەڵکو بوونەوەرێکە لەسەرو هەموو ئاژەڵەکانی ترەوەیە، کەئەم فەلسەفەیە لەناو هەموو کایەکانی بیرکردنەوەی ئێمەدا جێگەی بووتەوە، ئاسان نییە هەروا زوو بیگۆڕین، بەلاَم شاعیر لێردا ئەوە مندالْ دەڵێت هەر خۆشەویستسە وامان لێدەکات بەهەموو جیاوازییەکانمانەوە لەیەکتری بچین، بەشێوەیەك دەکرێت لەجوانیەکاندا لاسایی یەکتری بکەینەوە، دووەم خاڵیان ئەوەیە، مندالْ ئەوەندەی لەترسی سزا لەپیس بوونی جل و بەرگەکانی دەترسێت، ئەوەندە لەشتی تر ناترسێت، ئەوەتا ئەم مندالْە ئەوەندە ئەم کارەی خۆش ئەوێت، داوای لێدەکات بۆنی بکات، ئەگەر جلەکانیشی بەلیکی ئەم تەڕ بێت گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، گرنگ ئەو پەیوەندییە رۆحیەیە، کەلەنێوان ئەم دوو کەسەدایە، یان ئەم دوو بوونەوەرە جیاوازەدا، ئەم رستانە بۆ ئەو بارەمان دەبەن، چۆن جارێکی ترو لەشێوازێکی تردا ئەو پەیوەندییە مرۆییە بدۆزینەوە، کەدەکەوێتە نێوان هەموومانەوە، ئەوەشمان فێر دەکات کێن ئەوانەی دەبن بەهۆی ناهەمواری

باری ژیانمان، ئەم ئاماژانە بۆ منداڵی ئێمە چەند گرنگن، بەڵام کوا ئەو دامەزراوە پەروەردەیانەی کار بەم بنەمایانە دەکەن و هەوڵی دۆزینەوەی رستەیەك دەدەن لەرستەو ئاماژە کۆنەکان نەچێت، یان چۆن لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا کارێك بکەین، مانای نوێ بۆ پەیوەندیی و هەڵس و کەوتەکانمان بدۆزینەوە، یان ئەو هەموو وێنا ئاشتیانەی لەهۆنراوەی خۆزگەدا بەرچاو دەکەون، کەچۆن بانگەوازێکی نەواو بۆ ژیانێك دەکات تەنها پێکەوە ژیانی ئاشتی و خۆشی تێدا بێت، چەند گرنگە ئێمە نەوەیەك لەسەر ئەو فەلسەفەیە پەروەردە بکەین، کەیەکترین خۆش بووێت و لەیەکتری ببوورن و هەموو چرکەکانی ژیانیان پڕ بێت لەو ساتانەی لای ئێمە ناوی جەژنی لێدەنرێت، ئەگەر سەرنج لەکۆتایی ئەم شیعرە بدەین، ئەو خۆزگە مرۆییەمان بەرچاو دەکەوێت، کەچۆن وەك خەونی هەموو مرۆڤە ئاستیخوازەکان وایە، جگە لەخۆشەویستی هیچ پەیامێکی تریان بۆ ژیان پێنییە:

جەژنم بۆیە پێخۆشە
هەموو کەس دڵی خۆشە
خۆشەویستی ئەهێنێ
تۆوی ئاشتی ئەچێنێ
خۆزگە تەمەن و ژیان
جەژن ئەبوو دایە گیان.

لێرەدا لەناو ئەو هەموو مێژووە لەجەنگ و بەرەنگاریی و شەڕانگێزیدا، تەنها خۆزگە ئاشتییەکان دەتوانن پەیامێکی جوانی مرۆیی بن و هیواکانمان بەژیان زیاد بکەن، ئەمە جگە لەوەی پەروەردەکردنی نەوەی نوێ لەسەر ئەم بنەمایانە هۆکارە، بۆ ئەوەی چۆن نەوەیەکی ئازادو هەوڵدەر بۆ خۆشی هەمووان گەورە بکەین، ئەو ژیانەی لەئێستادا ناتوانین فەراهەمی بکەین، ئەمە یەکێکە لەگرفتەکانی ژیانی ئەمڕۆمان، کەهەموو هەوڵەکان بۆ ئەوەیە تەنها لەجەژنەکاندا هەست بەکەمێك خۆشی بکەین، بەڵام لەو کاتەی هەموو رۆژێك دەبێت بەجەژن، جەژنیش ئەو رەهەندە سەرسوڕهێنەرەی خۆی لەدەستدەدات، ئەو رەهەندە میتۆلۆژییەی، کەوەك رەمزێك تەماشا بکرێت، لەناو کایە قەیراناوییەکاندا هەموومان بەدوای ئەوەوەین سروتێك بۆ جیاوازی بدۆزینەوە، رۆژێك بۆ پێکەوە ژیان و ئەنجامدانی سروتێکی تەواو ئاینیی، ئەمەیە وادەکات هەموو رژەکانی ئێمە جەژن نەبێت، بەڵکو ساڵانە لەیەك کاتی دیاریکراودا ئەم سرووتە ئەنجامبدەین، یەکێك لەو خاڵانەی ئەم چەند دێڕە لەخۆی گرتووە، بوونی تێڕوانینێکە بۆ دنیایەك بێ جەنگ و بێچەوساندنەوە، دنیایەك تەنها مانا جوانەکانی تێدا بەرهەم بێت، نەك دووبارە بوونەوەی کارەساتەکان، لێرەوەیە شیعری منداڵانەی شاعیر، بگرە زۆرێك لەهاوچەرخەکانی شاعیر جیا دەکاتەوە، ئەم جیاکردنەوەیەش لەسەر ئەو بنەمایەی کەئەدەبی ئێمە لەرووی نووسینەوە زۆر نوێیە، وادەکات ئاسان نەبێت توێژینەوەیەکی وورد بۆ ئەو پێکهاتانە بکەین، کەئەم جۆرەی لەئەدەب لەسەر گەورە بووە، یان پێکهاتووە، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەم جۆرە لەئەدەب تاکو ئێستاش لای ئێمە لەژێر وێناکردنی واقع وەك خۆی دەناڵێنێت، کەئەم شاعیرەشمان لەهەندێك لەکارەکانی بۆ منداڵان لەم حاڵەتە بەدەر نییە، کەئێمە لێرەدا تەنها لەسەر ئەو بەرهەمانەی شاعیر قسە دەکەین، کەپەیوەندی بەمناڵەوە هەیە، ناچینە سەر کۆی بەرهەمەکانی تری، بەڵام لەم بەرهەمانەشدا هەندێك لەو کارانەمان بەرچاو دەکەوێت، کەراستەوخۆ هەمان وێنای واقع و کۆمەڵایەتی دووبارە کردووەوەتەوە، وەك لەشیعری پشیلە سوورەو چەندەهای تر، کەهەمان تێڕوانینی کۆمەڵایەتی بەمنداڵ دەبەخشێت، چۆن بەهەندێك هۆکاری ئەفسانەیی نەك زانستی رقی لەئاژەڵێك بێت، کەلەوانەیە لەهەموو ئاژڵەکانی تر لەئێمەی مرۆڤەوە نزیك بێت، پشیلە سوورە وەك هەموو بوونەوەرێکی تر خاوەنی غەریزەیە بۆ مانەوە، ئەویش ناچارە بۆ ئەوەی بژی هەندێك جار راو بکات، ئەمە بۆ خۆی کارێکە مرۆڤ ئاقڵانەتر دەیکات، بەڵام هەرگیز پێی ناڵێین خت خت، ئەم دروستکردنی رقە لای منداڵ هۆکارێکە بۆ ئەوەی لەو بوونەوەرەوە بترسێت، کەناوی پشیلەیە، ئەم رێك پێچەوانەی ئەو فەلسەفەیە کەتۆمی وایلدزنی کاری پێدەکات، کەپشیلە لەوێدا بوونەوەرێکە ئەوەندە هەوڵدەدات ژەمێك بخوات، ئەوەندە هەوڵی ئازاردانی بەرامبەر نادات، پشیلە لێرەدا لای منداڵ ئەو تایبەتمەندییە وەردەگرێت، کەچۆن بتوانین هەموو رەهەندە ئەفسانەیی و هەموو رەمزەکانی شەڕو گیانی شەڕخوازی لێدوور بخەینەوە، بیکەینە بوونەوەرێکەی ئاسایی، تامنداڵ بتوانێت لەکایەکانی خۆیدا بەشداری پێبکات، ئەمەیە جیاوازی ئەدەبێك کەخاوەنی باگراوندێکی فکریی و فەلسەفییە، لەگەڵ ئەدەبێکی خۆرسکدا، کەتەنها لەسەر یادەوەریی و ئەندێشەی کۆمەڵایەتی بۆ رازیکردنی کۆمەڵ کار دەکات و داهێنانەکانی دەخاتە روو، کاکەی فەلاح بۆ خۆی زادەی کۆمەڵێکی دواکەوتووە، ئەو لەناو ئەم پێکهاتە کۆمەڵەیاتییەی ئێمەدا لەدایك بووە، کەتاهەنووکەش خاوەنی بنەماکانی کۆمەڵی نوێ نییە لەبەر ئەوە ئاساییە، ئەگەر جۆرێك لەواقیعیەت بەسەر ئەدەبییەوە زاڵبێت، بەڵام لەهەمان کاتدا یەکێکە لەو نووسەرانەی لەبواری ئەدەبی منداڵدا ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە، کەم منداڵی کورد هەیە یەکێك لەهۆنراوەکەی ئەم شاعیرەی لەبەر نەبێت یان وەك گۆرانی نەیڵێتەوە، ئەمە جگە لەوەی منداڵ بەرو ئەو ئاراستەیەش پەروەردە دەکات چۆن بتوانن لەبیرکردنەو بڕیاریاریاندا ئازاد بن، ئەمانە وادەکەن بیرکردنەوە لەکارەکانی ئەم نووسەرە بەشێوەیەك لەشێوەکان ببێتە خاوەنی تایبەتمەندی خۆی.

یەکێك لەو شیعرانەی دەتوانرێت لەبواری پەروەردەدا سوودی لێوەربگیرێت و بکرێتە بنەمایەك بۆ فێربوونی جوگرافیا، لەقۆناغەکانی سەرەتاییدا، هۆنراوەی(دەمەتەقێیەك)ە، کەدەمەتەقێی نێوان هەرچوار وەرزەکەیە، کەمنداڵ دەتوانێت لەڕێگەی ئەم شیعرەوە سیماو پێکهاتەوەو جۆری وەرزەکان لەیەکتر جیابکاتەوو بیانناسێتەوە، بەشێوەیەك وەسفی وەرزەکان دەکات هەرەیەکەیان خاوەنی تایبەتمەندەی خۆیەتی، ئەم کارە وادەکات جوگرافیا لەپۆلە هەرە نزمەکانی خوێندنیشدا بخوێنرێت، هەروەها وەك رێنماییەکیش وایە بۆ خوێندکار یان بۆ منداڵ، تابزانێت چۆن لەگەڵ وەرزەکاندا مامەڵە بکات، ئەم جۆرە لەهۆنراوە دەکرێت بکرێتە دەلیلێك یان بەوێنەی نوێ بکرێتە شێوازێکی فێرکردنی منداڵ، کەچۆن لەگەڵ وێنەکاندا هەموو وەرزەکانی ساڵ بناسێتەوە، راستە شاعیر ئەو هۆنراوەی لەسەردەمانێکدا نووسیوە، کەئاستی چاپەمەنی زۆر لەدوا بووە، بەڵام خۆ ئێستا بەهۆی ئەو هەموو تەکنیکە نوێیەوە دەکرێت لەبەرگێکی جوان و نەخشەیەکی جواندا بەچاپبگەیەنرێتەوە، تاکو منداڵ بتوانێت سوودو چێژی لێوربگرێت،

کەزۆرێك لەهۆنراوەکانی شاعیر دەتوانن بین بەنامیلکەی بەسوود بۆ منداڵان، یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی هۆنراوەی زۆرێك لەو شاعیرانە ئەوەیە تێکەڵاوی چیرۆکیان کردووە، واتە بەزمانی شیعر چیرۆکمان بۆ دەگێڕنەوە، کەئەم کارەمان لەهۆنراوەکانی گەورە شاعیرانی وەك گۆران و بێکەسدا بەرچاو دەکەوێت، کەچۆن لەبری بەکارهێنانی زمانی چیرۆك بەهۆنراوە حیکایەتەکانمان بۆ دەگێڕنەوە، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، شیعر لای ئێمە مێژوویەکی درێژتری هەیە، هەروەها بۆ ئەزبەرکردن ئاسانترە، ئەمە جگە لەوەی چیرۆك لای ئێمە شەقڵێکی نوێیە لەنووسین، کەچیرۆك وەك توخمێکی گرنگی نووسین تاکو ئێستا لای ئێمە گرنگی تەواوی خۆی وەرنەگرتووە، ئەمەوادەکات ئامادەیی شیعر ئامادەییەکی بەهێزتر بێت، هەروەها لەو کاتەی شاعیر ئەم هۆنراوانەی نووسیوەوە، تاکە زمانی داهێنان شیعر بووە، بەتایبەتی بۆ منداڵ، لەبەرئەوە ئاساییە لەناو شیعرەکانی ئەم شاعیرەماندا ئەو جۆرە لەشەقڵی گێڕانەوەمان بەرچاو بکەوێت، ئەم شاعیرە وەك ئەوەی بۆ جزوگرافیا بسمانکرد، لەهۆنراوەیەکی تردا گرنگیەکی بەرچاو بەباڵندە دەدات، زۆرێك لەجۆرەکانی باڵندە بۆ منداڵ باس دەکات، کەلەهەندێك شوێندا بارگاوی دەکات بەو بنەما کەلتوریەی ئێمە بۆ هەندێك باڵندە هەمانە، کەکامیان شوومن و کامیان خاوەنی شەهامەتی خۆیانن، ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لەبوارەکانی ژیانی کردووە بەهۆنراوە، وەك لەهۆنراوەکانی حەفتانە و شانازیدا بەرچاو دەکەون، ئەمە جگە لەداڕشتەنەوەی ئەو چیرۆکەی هەموومان لەتافی منداڵیدا چێژمان لێوەرگرتووە، کەناوی شێری ساختەیە، ئەو کەرەی بەسەری خۆی کارناکات و بەلاشەی خۆی کێشمەکێش لەگەڵ ژیان ناکات، لێرەدا ئێمە دەچینە بەردەم دوو گریمانە، یەکەمیان شێر هێزێکە بۆ ترساندو دەسەلات، ئایا کەر لەبەرئەوە خۆی کردووە بەشێر تابگاتە پشوودان یان دەسەلات، دووەم شاعیر لەم هۆنراوەیەوە دەیەوێت چیمان پێبڵێت، ئایا دەیەوێت بڵێت ئەو کەسەی بەسەری خۆی و بەبەرگی خۆی هەوڵنادات دەرئەنجامەکەی هەر نووشستیە، هەرکامیان بێت ئەوەمان بۆ روونەکاتەوە، کەپێویستە مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی خواستەکانی خاوەنی خۆی بێت، نەك لەبەرگی ئەوانی تردا خۆی بشارێتەوە، یەکێك لەبنەماکانی کارکردنی رۆژگاری ئەمڕۆمان لەسەر ئەو بنەمایەیە، کەچۆن وەك تاکێکی نوێ لەناو کۆمەڵی مەدەنی ئەمڕۆدا هەست بەبوون و پێکهاتەی خۆمان بکەین.

یەکێك لەهۆنراوە بەرچاوەکانی شاعیر کەئەو دەم بۆ منداڵی نووسیوەو ئێستا وەك سرودێکی نیشتمانی لەسەر زمانی گەورەکانەوە دەوترێتەوە، سروودی (خۆشم ئەوێ)ـیە، کەلە ساڵی 1958دا نووسراوە، ئێستاش خاوەنی زایەڵەی تایبەتی خۆیەتی، زۆرێك لەکەناڵەکانی تەلەفزیۆن وەك سروودێکی نیشتمانی بەکاریدەهێنن، خۆشم ئەوێت وڵاتەکەم، بەشێکە لەو بیرکردنەوەی کەمنداڵ لەسەر بنەمای خۆشەویستی و رێزگرتن لەوانی تر پەروەردە دەکات، ئەوەندی لەسەر چۆنیەتی خۆشەویستی نیشتمانەکەی خۆی بنەماکانی بیرکردنەوەی خۆی بونیاد ناوە ئەوەندە لەسەر چۆنیەتی تێگەیشتن لەسەر ئەوی تر یان بەبەراورد بەوی تر بوونیادی بوونی خۆی نەناوە، ئەمە جیاوازی ئەم شاعیرە لەوانیتر، کەچۆن لەو تافەدا هەوڵی دۆزینەوەی ئەو بنەمایانەی داوە، کەپڕیەتی لەئاماژەی نائاراستەکراو، کەئەم حاڵەتە کەمتر لەنووسینی ئەو تافەدا بەدیدەکرا، ئەگەرچی زۆرێك لەنووسەرانی ئەو کاتە لەژێر کاریگەری ئەدەبی سۆسیالیستیدا دەیانووسی، یان بیردەکردەوە، کەئەم جۆرە نووسینانە بەشێوەیەك لەشێوەکان راستەوخۆیان لەگوتارو ئاراستەکردندا پێوە دیار بووە، بەڵام ئەم شاعیرەمان هەموو دەم هەوڵی دۆزینەوی ئەو ئاماژانەی داوە، کەئاماژەکان دەکاتە جۆرێك لەمەدلول، وەك لەهۆنراتوەی خۆشمدەوێدا بەرچاومان دەکەوێت، کەلەدوای ئەو هەموو ساڵە، واتە لەدوای ساڵی 1958وە بەنزیکەی پەنجا ساڵ مۆسیقارێك درك بەوە بکات ئەم هۆنراوەیە بۆ گەورە نووسراوە، نەك بۆ منداڵ، ئەگەرچی ریتم و کێش و قافیەی هۆنراوەکە، بەهەموو پێوانەکان بۆ منداڵ نووسراوە ، بەڵام پاش ئەو هەمووساڵە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئاوازدانەرێك ئەوەی لاڕۆشن دەبێت، کەئەم هۆنراوەیە بۆ گەورە نووسراوە، پێویستە کۆرسێك ئەم گۆرانییە بۆ گەورەکان بڵێت، تاکو هەستی نەتەوەییان بجوڵێنێت، ئەم دواکەوتنە لەتێگەیشتندا بۆ ئەم هۆنراوەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەدەبی ئێمە هێشتا نەیتوانیوە، تافێك بۆ خۆی دیاریبکات، کەبەچ شێوەیەك و لەچ ئاستێکدا داهێنان دەکات و بەکاری دەهێنێت، هەروەها بۆ ئەبێت هۆنراوەیەك بەهەست و زمانی منداڵ نووسرابێت، ئەمڕۆ بەهەناسەی گەورە بخوێنرێتەوە، کەبۆ هەندێك حاڵەت لەئێستادا رێك پێچەوانەیە، ئەوەتا ئەو بەرهەمانەی بۆ گەورە بەرهەم دەهێنرێت، زۆرترین ژمارەی منداڵ تەماشای دەکەن، بەتایبەتی لەبواری فێلمسازیدا، کەزۆرێك لەو فێلمە ئاستنزمانەی ئەمڕۆ بەناوی کۆمیدییەوە بەرهەم دێت، جگە لەکارێکی گاڵتەجاڕی منداڵانە هیچی تر نیین، ئەم دووجیاوازییە دەمانخاتە بەردەم ئەو گریمانەیەی، کەبەچ پێوانەیەك ئەم دوو حاڵەتە لێك بدەینەوە؟، وەك بەرهەمی دوو تالفی جیاواز، یان دوو داهێنان هەریەکەیان سەر بەتافێك بن و ئاماژەکانی لەکات و داهێنانی تایبەتدا لێکبدەینەوە، ئەمە گرنگترین، ئایا دەکرێت داهێنانی نیو سەدە بەر لەئێستا لەزۆرێك لەداهێنانەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەو هەموو تەکنەلۆژیایەوە گەورەترو ووردترو بەدیقەتتر بێت؟، ئەمە ئەو پرسیارە گرنگەیە، کەلەئێستا وەڵامی دەمانخاتە بەردەم ئەو گریمانەیەی کۆمەڵگای ئێمە بەرو دواوە گەڕاوەتەوە یان چی؟.

خاڵێکی تر لەپرۆژەکانی ئەم شاعیرەدا هەوڵی داوە زۆرێك لەچیرۆکە مللییەکان بکاتە هۆنراوەو دیدی منداڵانی پێشاد بکات، وەك چیرۆکی شێری ساختە، دووپشك و کیسەڵ، گورگ و برخۆلەو راوکەر، هوموو ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەوەی ئەم شاعیرە خاوەنی پجدیی بووە بۆ منداڵان، کەدەتوانین لەهەموو نوسینەکانی تری ئەم شاعیرە جیای بکەینەوە، ئەگەر کاکەی فەلاح شتێکی هەبێت شانازی پێوە بکات، یان توانای لێدوانمان لەسەری هەبێت، ئەوا تەنها ئەو بەرهەمانەیە کەبۆ منداڵان تەرخانی کردووە، بەتایبەتی ئەو هۆنراوانەی لەدیوانی جریوەدا چاپی کردوون، کەکەم منداڵی کورد هەیە ناوی دیوانی جریوەی نەبیستبێت و چەند

هۆنراوەیەکی لەو دیوانە لەبەر نەبێت، ئەم تایبەتمەندیەی کاکەی فەلاح لەئەدەبی منداڵاندا وامان لێدەکات، بڵێین سەرەتای ئەدەبی منداڵان بۆ ئەم دەگەڕێتەوە، بەوەی کەتوانیویەتی شەقڵێکی نوێ لەنووسین بۆ منداڵ بهێنێتە ئاراوە، ئەویش نووسینی چیرۆکە بەزمانی شیعر، کەئەم شەقڵە بۆ ئەدەبی نووسراوی کوردی گەلێك تازەیە، کەپێشتر ئەم ئەدەبە لەناو ئێمەدا خاوەنی دەنگێك نەبووە،

بوونی کاریگەری ئەدەبی بیانی هۆکارێکی راستەوخۆ بووە، بۆ دۆزینەوەی شەقڵێکی نوێ، ئێمە لێرەدا بەم هێندە کەمە بەقسەکردن لەسەر کاکەی فەلاح کۆتایی بەباسەکەمان دەهێنین، ئەگەرچی شیعری منداڵان لای کاکەی فەلاح پێویستی بەلێووردبوونەوەی زیاترە، لانیکەم لەبەرئەوەی چەند نەوەیەك هۆنراوەو سروودەکانی ئەم شاعیرەی ووتوەتەوە، چەند نەوەیەك بەدرێژی

هەنگاومان دەنا، بەو هۆنراوە جوانەی ئەو پۆ پۆلی دەکێشا، قوتابخانەمان خۆشدەویست و باوەشمان بۆ پۆلی نوێ دەکردەوە، هەموو ئەمانە وامانلێدەکات بەئەمەکەوە ئەم مرۆڤە گەورەیەی جوانترین داهێنانەکانی تەنها ئەو شیعرانە بوون، کەبۆ منداڵانی نووسیوە، ئەو هۆنراوایانە بوون، کەئەوپەڕی بەرائەتی لێدەتکا، ئێمەش بەو یادەوەریانەوە دەچینە بەردەم دیوانی چریووەو جگەرگۆشەکانو









